عەلی باپیر

# پێشمەرگەی ئیسلام

## یان

## مسوڵمانی موجاهید کێیە و چۆنە؟








چاپی چوارەم

2020

ناوی کتێب: **پێشمەرگەی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید کێیە و چۆنە؟!**

ناوی نووسەر: **عەلی باپیر**

دیزاینی ناوەوەو بەرگ: **زەردەشت کاوانی**

نۆبەتی چاپ: **چوارەم ١٤٤١ك - ٢٠٢٠ز**

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

٢١x١٤ سم، ١٧٠ لاپەڕە



# پێشەکیی

دەزگای پۆلیس و پاسەوانییەکانی
کۆمەڵی ئیسلامیی

سەرەتا سوپاسی جەنابی (مامۆستا عەلی باپیر) دەکەین، کە مۆڵەتی پێداین ئەم پەرتوکە بەپێزە: (پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید، کێیەو چونە؟!) چاپ بکەینەوە، کە ئەمە چوارەم جارە چاپ دەکرێتەوە و ئەم چاپەی: (دەزگای پۆلیس و پاسەوانییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) پێی هەڵدەستێ.

ئێمە کە بڕیارمانداوە پێشمەرگەو پاسەوانی ئیسلام بین و، ئەندامی پارتیکی ئیسلامیی بین، دەبیت ڕەوشت و کردارو گوفتارمان ئیسلامیی بێت و، لە چوار چێوەی ئایینی ئیسلامدا بێت.

بە تایبەتی کە ئەرکی پێشمەرگایەتیی و پاسەوانییمان لە ئەستۆ گرتوەو، بڕیارمانداوە: پێشمەرگە و پاسەوانی ئیسلام بین.

شایانی باسە: ئەم بەرهەمەی مامۆستا (عەلی باپیر)یش، کە سی و یەك (٣١) سال پیش ئێستا نووسراوە، وەك ئەوە وایە ئێستا نووسرابێ و، بۆ ئێمەی پاسەوان و، بۆ ئەم کات و ساتە بێت.

چونکە ئەم کتێبە هەموو و ئەرك و کارەکانی بە پێی شەریعەتی ئیسلام، بۆ پێشمەرگەو پاسەوانی ئیسلام دیاریی کردوون.

بۆیە پێویستە لەسەرمان، ئەم بەرهەمەی مامۆستا بکەینە مەنهەجی کاری پاسەوانییمان و، بە کرداریی لە ئەرکی ڕۆژانەماندا پراکتیزەی بکەین و، ناشگونجێ خۆمان بەپاسەوانی ئیسلام بزانین، بەڵام نەزانین ئایین و بەرنامەی ئیسلام چۆن چۆنی ئەرك و کارە جۆراوجۆرەکانی بۆ دیاریی کردووین!!

دووبارە زۆر سوپاسی بەڕێز (مامۆستا عەلی باپیر) دەکەین، بۆ پێدانی مافی چاپکردنەوەی ئەم بەرهەمەی بە: (دەزگای پۆلیس و پاسەوانییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی).

٢٠١٩/١١/١

# پێشەکی چاپی چوارەم

إِنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾ النساء

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾ الأحزاب

أما بعدُ، فإن خيرَ الحديثِ كتابُ اللهِ وخيرَ الهدي هديُ محمدٍ صلَّى اللهُ عليهِ وسلَّمَ وشرَّ الأمورِ محدثاتُها وكل محدثة بدعة وكلَّ بدعةٍ ضلالةٌ، وكلَّ ضلالةٍ في النارِ.

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویست!**

ئەم کتێبەی بەردەستت: یەکێکە لەبەرهەمەکانی بەندە کە لەڕۆژانی (خەباتی شاخ)دا نووسیومن و، لە ڕابردوودا سێ جاران چاپکراوە:

**١**ـ چاپی یەکەمی لەساڵی: (١٩٨٨ز - ١٤٠٨ک)دا لەبناری قەندیل / گوندی قەڵاتووکان ـ بارەگای هێزی حەمزە، بووە و،

**٢**ـ چاپی دووەمیش لەساڵی: ١٩٩٥ز - ١٤١٥ک دا.

**٣**ـ چاپی سێیەمیش لەساڵی: ١٩٨٨ز - ١٤١٩ک دا.

ئێستاش کە دەمانەوێ بۆ جاری چوارەم چاپی بکەینەوە، زیاتر لەسەر داوا و پێشنیاری: (دەزگای پۆلیس و پاسەوانەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی)یەو، ئەوان بەپێویستیان زانی بەمەبەستی:

زیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوە و، هۆشیاری و بێداریی و، پەروەردەبوون و تۆکمە و توندوو تۆڵ بوون و... هتدی ئەو براو خوشکانەی لەوبوارەدا کاردەکەن، ئەم بەرهەمە جارێکی دیکە و، لەقاڵب و فۆڕمێکی تازەدا، چاپ و بڵاوبکرێتەوە.

لە کۆتایی ئەم پێشەکی یە کورتەش دا، بەچاکی دەزانم سێ سەرنج، بخەمە ڕوو:

**یەکەم:** بۆ ئەم چاپی چوارەمە، هەوڵم داوە دەستێکی خێرا، بەم بەرهەمەدا بهێنم و لەچەند شوێنێك دا، هەندێک وردە دەستکاریی چەند ناوونیشان

و تەعبیرێك بکەم، بەڵام بە کەمیی، چونکە مەبەستم بوو، ئەم بەرهەمە: مۆرك و کەسایەتیی تایبەتی خۆی: هی سی و یەك (٣١) ساڵ لەمەوبەر: (١٩٨٨ز ـ ٢٠١٩ز/ ١٤٠٨ك ـ ١٤٤١ك) هەر پێوە بمێنێ.

**دووەم:** هەرچەندە: ئەم بەرهەمە کاتی خۆی بەتایبەت بۆ: برا پێشمەرگە و موجاهیدەکانی ئەوساکە نووسراوە، بەڵام ئەوسا و ئێستاش: بۆ خوێنەرانی بەگشتی بەهرە و کەڵکی خۆی هەر هەیە و، زۆر مەسەلەی تێدا خراونە ڕوو، لە بوارەکانی: بوونناسیی و، ئیمان و عەقیدە و، تێڕوانین و، پەرستشەکان و، ئاکار و ڕەوشتە کەسیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییەکان دا، کە مسوڵمان بەگشتی پێویستە لێیان ئاگاداربن و پێیانەوە پابەند بن.

**سێیەم:** گرنگیشە خەڵکی مسوڵمان و دینداری ئێستا، بزانن: کار و کاروانی جم و جۆڵ و چالاکیی ئیسلامیی لە کوردستان دا، چۆن چۆنی ئاراستە کراوە، لەبواری دینداریی و مسوڵمانێتی دا بەگشتیی و، لەبواری پێشمەرگایەتیی و هەڵس و کەوتی نێو بنکە و بارەگا و، مامەڵە لەگەڵ خەڵک و کۆمەڵگادا، بەتایبەت!

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،
وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

٥ ربيع الأول ١٤٤١ك/ ٢٠١٩/١٠/٢ز
هەولێر

**عەلی باپیر**

# پێشکەش بێ

بەو پێشمەرگە پارێزکارو جەرگدارانەی، کە بەقسەو وتارو کردەوەو ئاکارو سەروسیمایان، دەیسەلمێنن: کە پێشمەرگەی ئیسلامن و، شوێن کەوتووی قورئان و، قوتابی پێغەمبەرانن (علیهم السلام)و، لە بواری هەڵس و کەوت و ڕەفتاردا: هەتا بڵێی بەڕێزو حورمەت و دڵ نەرم و لێبوردەو لێزان و نەرم و نیانن و، بۆ دیفاع لە ئیسلام و لەسەرکردنەوەی مەزلووم و مافخوراوانیش: هەمیشە وەك تفەنگێکی لەسەر پێ، گیان لەسەر دەست و فیداکارن و، پڵنگی بێشەو شێری مەیدانن.

## ڕێ خۆشکردن

**ئەم کتێبە لەم چاپی چوارەمەی دا، بەم شێوەیەی لێهاتوە:**

١ـ پێشەکییەك بۆ ئەم چاپە نووسراوە، کە لە سێ خاڵدا، سێ سەرنجی گرنگ خراونەڕوو.

٢ـ پێشەکی چاپی یەکەم و دووەم، سێیەمیش وەك خۆیان، بێ دەستکاریی هێڵراونەوە.

٣ـ لەسەرجەم کتێبەکەدا، جاروبار وردە دەستکاریی لەهەندێك وشەو تەعبیردا کراوەو، لەچەند شوێنێکی کەمیش، چەند بڕگەو دێڕێك زیاد کراون.

٤ـ خاڵێکی سەربەخۆی گرنگ بەناوی: (ڕەوشتە جیهادییەکانی مسوڵمانی موجاهید) زیاد کراوە[1]، کە لەم چاپەدا بۆتە خاڵی شەشەم، کە بابەتێکی زۆر گرنگەو سەرجەم لە نۆ (٩) بڕگان پێك هاتوە، ئیدی بەهیوای ئەوە کە ئەم نووسراوە، کەلێنێکی باش بگرێ لەو کەلێنانەی کە لە کارو چالاکی ئیسلامیی و جیهادییمان دا هەن و، پێویستییان بەگرتن و پڕکردنەوە دەکات، بۆئەوەی بچێتە ئاستی بەرزی ئیسلامەوەو، خوا بەلوتف و بەخششی بێسنووری خۆی، یارمەتییمان بدات کە هەموو

---

(١) ئەم خاڵە لە چاپی سێیەمەوە، زیاد کرا بوو.

کەلێن و بۆشاییەکانی دیکەش بگرین و پڕبکەینەوە، بەڵکو هەرچی زیاتر کارو جموجۆڵی ئیسلامییانەمان، جێگای دڵخۆشیی و بەرچاو ڕوونیی خۆمان و دۆستانمان و، بیانوو بڕکردن و دەمکوت کردنی ناحەزانمان بێت، تاکو سەرەنجام ببێتە مایەی هێنانەدی هەموو ئەوئامانجە شەرعییە بەرزانەی، کە جیهاد بۆ هێنانە دییان بەرپاکراوەو، دەکرێ لەکوردستان و، بەش و پارچەکانی دیکەی جیهانی ئیسلامیشمان دا.

# پێشەکی چاپی سێیەم

الحمدالله رب العالمين، وصلى الله تعالى و بارك على خير خلق الله أجمعين، سيد الأنبياء والمرسلين محمد، إمام المتقين، وقائد المجاهدين، وآله أَجمعين، من القرابة والصحابة والأتباع الصادقين.

**خوێنەرە بەڕێزەکانم!**

ئێستا کە پێشەکی بۆ چاپی سێیەمی کتێبی: (پێشمەرگەی ئیسلام یان مسوڵمانی موجاهید) دەنووسم، ئاماژەکردن بەچەند مەسەلەیەك بە پێویست دەزانم:

**١ـ** وەك لە پێشەکی چاپی دووەم دا گووتومە: ئەم کتێبە کاتێك نووسراوە کە بەندە فەرمانده‌ی هێزی (حەمزە)بووم، کە ئەوکاتە بارەگای هێز لە گوندی (قەڵاتووکان)ی بناری قەندیل بوو، ئەوکاتە ئەو ڕێڕوونیی و ئامۆژگارییانە کە لێرەدا نووسراون، بەرهەمی ئەزموونی کردەیی و هەڵقوڵاوی واقیعی ژیانی پێشمەرگایەتیین و، لە حاڵەتێکی تیۆریی (نظري)دا نەنووسراون!.

**٢ـ** هەرچەندە ناوونیشانی کتێبەکە، بەڕواڵەت تەنها پەیوەندیی بەبرایانی پێشمەرگەو موجاهیدەوە هەیەو، ڕووی لەبرایانی فەرماندەو

بەرپرس نیە، بەڵام لەڕاستییدا وانیەو، پێم وایە زیاتر فەرماندەو بەرپرسەکان لێی بەهرەمەند دەبن و، ئەوان زیاتریان پێویست پێیەتی و، بێگومان ئێمەش هەرکامێکمان بەر لەوەی هەرشتێك بین، پێویستە موجاهید و پێشمەرگەیەکی ڕاستەقینە بین و، وەنەبێ بەوە کە ئەرکێکی بەرپرسیارێتییمان دەکەوێتە سەرشان، لەنێو برایانی موجاهیدمان دا، لە موجاهید و پێشمەرگە بشۆڕێین و، پلەوقۆناغی موجاهیدیی هەڵبوێرین! مەگەر یەکەمین و چاکترین و گەورەترین موجاهیدی ئەم ئایینە، پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه وسلم) نەبووە؟! وەك خوای باڵادەست و زاڵ پێی فەرمووە:

﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ...﴿٨٤﴾﴾ (النساء: ٨٤)

هەروەها پێی فەرمووە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ ... ﴿٧٣﴾﴾ (التوبة:٧٣)

هەروەها پێی فەرمووە: ﴿فَلَا تُطِعِ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَجَٰهِدۡهُم بِهِۦ جِهَادٗا كَبِيرٗا ﴿٥٢﴾﴾ (الفرقان:٥٢).

ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی دیکەشەوە، بێگومان برایانی بەرپرس و فەرماندە لەهەر ئاست و پلەیەکی بەرپرسیارێتیی دابن، پێویستە لەهەموو ڕووێکەوە باشترین و ڕاستترین سەرمەشق و چاوساغی برایانی پێشمەرگەو موجاهید بن و، نابێ ڕازی بن بە پلەکانی بەرپرسیارێتیی دا بەرز بنەوە، بێ ئەوەی لەهەموو بوارەکانی تێگەیشتن و ڕۆشنبیریی و پارێزکاریی و

ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسەنددا، پێهەڵاَبچن و بەرز ببنەوە، بەکورتیی: نابێ برایانی بەرپرس و فەرماندە، تەنیا بەناوونیشانی ڕووت و بێ کاکڵ و جەوهەری بەرپرسیارێتییان، قەناعەت بکەن بەبێ گوێ دانە پێکهێنەرەکان (مُقَوِّمات)و پێداویستییەکانی، چونکە ئەوکاتە سەرەڕای ئەوەی کە ناوی زل و شاری وێران دەردەچن و، ناتوانن ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن و، ئەوانەی کە لەژێر دەستیانن، باربێنن و پەروەردە بکەن، بەڵێ وێڕای ئەمە: کە بە خیانەت لە ئەمانەتی بەرپرسیارێتیی لەسەریان حیساب دەکرێ، لەبرا موجاهیدەکانی بن دەستیشیان بەجێ دەمێنن و، هەرکاتێکیش پێشمەرگە هەستیان کرد کە لەفەرماندەکەیان، بەتواناترو لێهاتووترن، ئەندازەی گوێ گرتن و بەقسەکردن (السمع والطاعة)یان کەم دەبێتەوەو، قەناعەتیان بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانیان نامێنێ!.[1]

٣ـ هیواداریشم ئەم کتێبە ببێتە هۆی بەرچاو ڕوونکردنەوەی برایانی موجاهیدمان و، هۆشیارکردنەوەیان لەهەموو ئاستەکاندا، بەشکم بە ڕەچاوکردن ولەدڵ گرتن و جێبەجێ کردنی ئەو ڕێڕوونیی و ئامۆژگارییانەی کە لەنێو خۆی گرتوون، ئەو هەڵس و کەوت و ڕەفتارە ناشەرعییە کرچ وکاڵانە نەمێنن و، بن بڕبکرێن، کە بەداخەوە کەم و زۆر برا پێشمەرگەکانمان، پێیانەوە گیرۆدە بوون و، بوونەتە مایەی بەهانە کەوتنە دەست و، زەمینە خۆش بوون، بۆ پڕوپاگەندەی ناحەزانی ئیسلام و توانج پلار گرتنە ئیسلامییەکان و، ڕەنجان و نیگەرانیی و سڵەمینەوەی خەڵکێکی مسوڵمان و دۆست و دڵسۆزیش.

---

(١) هەرچەندە لەڕووی شەرعییشەوە ئەوە پاساو (مبرِّ)ێکی ڕەوانیەو، مادام فەرمانەکەیان ناشەرعیی نەبێ، (سمع و طاعة)هەر پێویستە.

ئنجا وەك زۆر جاری دیکەش گووتوومانە: ئەرکی هەرە مەزن و سەرەکیی ئێمەی مسوڵمان و ئیسلامیی، پاش دینداریی و خواپەرستیی کردنی خۆمان، ئەوەیە کە بەهۆی ڕەفتارو هەڵس و کەوتی ڕاست و دروست و شەرعییانەمانەوە، ببینە مایەی هیدایەتدرانی خەڵك و، بەرەو ئیسلام و ئیمان هێنانیان، کە بێگومان ئەوەش گەورەترین و بەرزترین و پیرۆزترین ئەرکەو، مایەی سەربەرزیی و شانازیی دنیاو دوارۆژمانە، خوای کارزان و میهرەبان فەرموویەتی:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا۟ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ﴾ (البقرة:١٤٣)...

واتە: ئاوا ئێوەمان گێڕاوە بەچاکترین کۆمەڵ بۆئەوەی شایەدی ڕاستیی ئایینی خوا بن، بەسەر خەڵکەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم)بەسەرتانەوە شایەد بێت.

٤ـ بێگومان لە کۆمەڵێکی ئیسلامیی دا، هەموو ئەندامانی وردو درشت بەقیادەوقاعیدەو، ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگەو، هەموو کادیرە جۆراو جۆرەکانەوە، وەك ڕاگەیاندن و پەیوەندییەکان و کۆمەڵایەتیی و بانگەواز... پێوستە حاڵەت وتایبەتمەندییەکان (خصائص)ی موجاهید بوون و پێشمەرگایەتیی خاڵی هاوبەش (القاسِمُ المُشتَرَك)ی هەموو لایەك بێت و، وا گومان نەبردرێ کە (موجاهید بوون)تەنها لەسەر برایانی پێشمەرگە تاپۆ کراوە، بەڵکو وەك پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد: پێویستە موجاهیدبوون، بەردی بناغەی کەسایەتیی هەر کامێکیان بێت و، هەرچەندە لەکاتی ئاسایی دا هەرکەسە بەپێی پسپۆڕیی و

شارەزایی خۆی، لەسەنگەری تایبەتیی خۆیدا کار دەکات، بەڵام لەکاتی نائاسایی دا کە پێویستی کرد، هەموویان پێشمەرگەی بەکردەوە بن و، هیچیان خۆیان پێ لە (موجاهید بوون) بەرزترو گەورەتر نەبێت، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکاتی نائاسایی و لێقەومان و پێویستیی دا، لەهەموو هاوەڵە بەڕێزەکانی، موجاهیدترو فیداکارترو چالاکتر بووە، بەشایەدیی هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆیان خوا لێیان ڕازی بێ.

مەبەستیشم لەم ڕوونکردنەوەیە ئەوەیە، کە هیچ کەس وانەزانێ: لەسۆنگەی ئەوەوە کە فلانە پلەی بەرپرسیارێتیی هەیە، لەسەرووی ئاستی موجاهید بوونەوەیەو، پێویستیی بەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانە نیە، کە لە بابایەکی پێشمەرگەدا، بەمەرج گیراون! چونکە وەك گوتمان و دووبارەی دەکەینەوە: هەموو ئەندامێکی درشت و وردی کۆمەڵێکی ئیسلامیی، دەبێ بەر لەهەرشتێکی دیکە، موجاهید و پێشمەرگە بێت و، ئامادەیی و تواناو شایستەیی جەنگ و جیهادی هەبێ.

٥ـ لەکۆتاییشدا لەخوای پەروەردگارو بەخشەر دەپاڕێمەوە: هیدایەتمان بدات خۆمان بەو شێوەیە لێ بکەین، کە بۆخۆی فەرمانی پێ کردووین و پێغەمبەرەکەی (صلی الله علیه وسلم) فێری کردووین، بەڵکو لەدنیاو دوارۆژدا، شایستەی ئەوەبین کە خوای باڵادەست و میهرەبان موژدەو بەڵێنەکانی خۆیمان بۆ بەجێ بەجێ بکات، چونکە بێگومان ئەگەر ئێمە بەو جۆرە بووین، کە خوا ڕەزامەندیی لە سەرەو فەرمانی پێ کردووین، خوای دادگەریش بۆئێمە، بەوجۆرە دەبێ کە داوای لێ دەکەین و لێی چاوەڕوان دەکەین، وەك فەرموویەتی:

﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ١٥٢ ﴾ (البقرە:١٥٢).

توێژەرەوانی قورئانیش لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا گوتوویانە: (فَآذكروني بالطاعة أذكركم بالإستجابة) واتە: بەفەرمانبەریی کردنتان بۆم، یادم بکەن، منیش بە بە دەنگەوەهاتن و وەڵام دانەوەتان، یادتان دەکەم.

سبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ،
أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٦جەمادی یەکەم ١٤١٩ کۆچی

١٩٩٨/٨/٢٨ زایینی/هەڵەبجە.

# پێشەکی چاپی دووەم

الحمدالله حق الحمد، والصلاة والسلام على العبد، سيدنا محمد والآلِ والصَّحْب، والسّائرين عَلى الدَّرْب.

خوێنەری بەڕێز! ئەم کتێبەی بەردەستت دەوری هەشت (٨) ساڵ پێش ئێستا نووسراوە لەکاتێکدا کە بەندە بەرپرسی هێزی (حەمزە) بوو لە بنارەکانی شاخی (قەندیل)، لە ڕاستییدا من ئەو کات و سەردەمە، بەقۆناغێکی زۆر گرنگ و بەپێز دەزانم لەمێژووی جم و جۆڵی ئیسلامیی دا، چونکە قۆناغی سەرەتاو بنیادنان بوو، ئەوبەرهەمانەش کە بەندە لەو سەردەمی دا نووسیونی، ئێستا کە چاویان پێدا دەگێڕمەوە، هەست بەتام وچێژو بەرەکەتێکی تایبەتی دەکەم، هەرچەندە ئەوکاتی و دواییش هەندێك هۆکاری دەروونیی ومیزاجیی، تاڕاددەیەکی زۆر بوونە پەرچ و لەمپەری، بەهرە لێ وەرگیرانی ئەو بەرهەمانەی بەندە، لەسەر ئاستی گشتیی بەڵام بەهەرحاڵ:

﴿ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَآءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمْكُثُ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ (الرعد:١٧)

وادیارە ئەو بەرهەم و نووسراوانە، ئێستاش خەڵکێکی زۆر بۆیان تامەزرۆیە، بۆیە پەیتا پەیتا لەلایەن ئەندامانی وردو درشتی حیزبەوە،

بەتایبەت ڕێکخستن و هێزی پێشمەرگە، داواکاریی لەچاپدانەوەی ئەم بەرهەمە، ئاراستەی بەندە کراوەو، برایانێکی دڵسۆزو مشورخۆریش، بیانووی بێ ئیمکانیەتیی و کەم دەرفەتییان بڕیوەو، ئامادەیی خۆیان پێشان داوە، کە ئەرکی ئەو کارە بەئەستۆی خۆیانەوە بگرن.

ئنجا ئەوە لەم کتێبی: (پێشمەرگەی ئیسلام)ەوە، دەستمان پێ کردو، هیواداریشم ئەو بەرهەمانە، کەلێنێکی گەورەی جم و جۆڵی ئیسلامیی لەبواری فیکرو فەرهەنگ و بەرنامەی کار (منهج العمل)دا پڕبکەنەوەو، چاوەڕێشم کە برایانی دڵسۆزی ئیسلامییمان لەنێو حیزبەو دەرەوەی حیزبیش دا بەخستنە ڕووی تێبینی و پێشنیارو ڕەخنەو هەڵسەنگاندنەکانیان، ئەو بەرهەم و نووسراوانە، بەهێزو پێزتر بکەن و، دڵی بەندەش خۆشترو، ئاسۆی کارو چالاکیی ئیسلامییش لە کوردستاندا ڕونترو گەشتر بکەن، ئیدی بەو خوایەتان دەسپێرم کە هەرچییەکی پێ بسپێرێ زایەی ناکات.

عــەلی بـــاپیر

١٤/ذی الحجة‌ی/١٤١٥کۆچی ١٣/٥/١٩٩٥




# پێشەکی چاپی یەکەم

**خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!**

خوای بەرزو مەزن پشتیوان بێ، لەم کتێبەدا هەوڵ دەدەین بە کورتیی و پوختیی لەچەند خاڵێك دا، پێشمەرگەی ئیسلامت پێ بناسێنین، بۆ ئەوەی ئەگەر پێشمەرگەی ئیسلام بی، تێ بگەی کە دەبێ چۆن بی، تاکو لە ئیسلام بوەشێیتەوەو، بگونجێ پێت بگوترێ: (پێشمەرگەی ئیسلام)، ئەگەر پێشمەرگەش نەبی، یان پێشمەرگەبی، بەڵام پێشمەرگەی ئیسلام نەبی، بۆت دەردەکەوێ: کە پێشمەرگەی ئیسلام کێیەو چۆنە!! تاکو لەناسینی پێشمەرگەی ئیسلام دا، بەهەڵەدا نەچی و، دوومەڵ بە بەز حاڵی نەبی!!

هەڵبەتە بەڵگە نەویستیشە: کە ئیسلام هەروەك چۆن لەهەموو بوارێك دا هەڵوێستی تایبەتیی و سەربەخۆی هەیەو، لەهەموو ڕێچکەو بیردۆزە دەستکردەکان جیایە، پێشمەرگەیەکیش کە ئیسلام دەیڕەخسێنێ و باری دێنێ، پێشمەرگەیەکی تایبەتی و هەڵبژاردەو دانسقەیەو، لەهەموو شتێك دا لەغەیری خۆی جۆێیەو، خاوەنی کەسایەتییەکی سەربەخۆو تایبەتییە، ئنجا لە حاڵێکیش دا، بابایەك بە درۆو بە ناهەق خۆی بە پێشمەرگەی ئیسلام لەقەڵەم بدات و، لێشی نەوەشێتەوەو، ڕێی نەکەوێ پێشمەرگەی ئیسلام بێ، ئەوە بێگومان

وەك پێشینان گوتوویانە: (مەیدانی درۆیە کورتە)، حەتمەن حەتمەن بەشەنەو سێلکەی خەبات و تێکۆشان و، لەنێو کەوو بێژینگی جم و جووڵ و چالاکییاندا، کاودان و، گەنم و زیوان، لێك جوێ دەبنەوەو، دەکەونە گۆڕێ! عەرەبیش لەوبارەوە گوتوویانە:

سوف ترى إذ آنجلى الغبار        أفــرسٌ تحــتك أم حــمــار!!

واتە: لەمەودوا کاتێك تۆزو خۆڵ و تەمومژ لاچوو، بۆت دەردەکەوێ داخۆ: ئەسپ سواری، یان کەر سوار!

بناری قەندیل/ قەڵاتووکان (بارەگای هێزی حەمزە)

١٤٠٨ کۆچی ١٩٨٨ زاینی







## پێشمەرگەی ئیسلام یان موجاهید كێیە؟!

وشەی (پێشمەرگە) وشەیەكی بەرز و جوانە و لەسەرەتای دەست پێكردنی جم و جووڵ و شۆڕشی ئازادیخوازانەی گەلی كوردی مسوڵمانەوە داهێنراوە، وشەیەكی پڕ بەپێستیشە بۆ مرۆڤی نیشتیمان پەروەر و گەل پەروەر، كە ئامادەیە سەروماڵی خۆی بەخت بكات لە پێناو ئازادی و ڕزگاری گەلەكەی دا، پێغەمبەریش - (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((مَنْ قُتِلَ دُونَ مَظْلَمَتِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ)) (أخرجه أحمد برقم: ٢٧٧٩، والنسائي برقم: ٤٠٩٣، وصححه الألباني)... واتە: هەركەسێك لەسەر قبووڵ نەكردنی ستەم بكوژرێ ئەوە شەهیدە.

وشەی پێشمەرگە وشەیەكی لێكدراو (مُرَكَّب)ە و لە وشەی (پێش)و (مەرگ) پێكهاتوە، واتە: ئەوكەسەی كە مەرگی خۆی وەپێش دەخات یان گیانی خۆی پێش كەش دەكات.

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە وشەی پێشمەرگە بەتەنها یەك مانای ڕاست هەڵدەگرت: ئەویش ئەوەیە کە پێشمەرگەی ئیسلام کەسێکە کە مەرگی خۆی پێش مەرگی ئیسلام دەخات، یان گیانی خۆی پێشکەش بە ئیسلام دەکات.

بەڵێ لەڕوانگەی ئیسلامەوە تاقە شتێك کە لەوە بوەشێتەوە ئینسان خۆی بەقوربان و بەلاگێڕی بکات و، سەری لەپێناو دانێ، تەنها خواو بەرنامەی خوایە، دەنا مرۆڤ جگە لە خواو بەرنامەکەی لەپێناوی هەرشتێکی دیکەدا بڕوات خەسار دەبێ! چونکە هەرچی لەئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، بۆخاتری مرۆڤ دروستکراوە، هەڵبەتە ئەوەی گوتیشمان ئەوە ناگەیەنێ کە پێشمەرگەی ئیسلام لەسەر نیشتیمان و نەتەوەکەی وە دەنگ نایەت و، دژی ستەم و زۆرو بێ دادی ناوەستێ و لەسەر چەوساوان ناکاتەوە!!

چونکە ئایین و بەرنامەی خوا بۆیە هاتوە کە لەسەر بناغەی خوا بەیەکگرتن (التوحید)، دادگەریی و چاکەکاریی و ئازادیی بچەسپێنێ و، ڕەگ و ڕیشەی کوفرو خراپەکاریی و ستەم و بێ دادیی لەبن بێنێ، هەڵبەتە هەموو ئینسانێکیش پێویستە یەکەمین هەنگاوی لەخۆیەوە دەست پێ بکات و، لەپێش دا چارەی دەردی خۆی بکات، وەك خوا بەپێغەمبەری پێشەوای فەرمووە:

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ ﴾ (الشعراء:٢١٤)

واتە: تیرەو هۆزە نزیکەکەت ئاگادار بکەوە.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام، لەهەموو کەس پتر لەسەر گەل و نیشتمانەکەی دەکاتەوەو، هەوڵ دەدات، کە نیری ستەمکار لەسەر ملی گەلەکەی لاببات و، وڵاتەکەی لە دوژمنی داگیرکەرو چەوسێنەر پاك بکاتەوە، بەڵام جیاوازیی بنەڕەتیی لەنێوان پێشمەرگەی ئیسلام و پێشمەرگەی ڕێچکەو بیردۆزەکان دا، ئەوەیە کە پێشمەرگەی ئیسلام بۆیە هەوڵی ئازادیی نیشتمان و ڕزگاریی نەتەوەکەی دەدات، چونکە خوا فەرمانی پێ کردوەو، بەبێ وڵاتێکی ئازاد و گەلێکی سەربەخۆش ناگونجێ ئایین و بەرنامەی خوا بچەسپێ!![1]

بەکورتی: پێشمەرگەی ئیسلام، کەسێکە کە مەرگی خۆی ڕەپێش ئیسلام دەخات و، خۆی لەڕێی خوادا بەخت دەکات، ئنجا یەکێك لەیاساکانی ئیسلام و یەکێك لەفەرمانەکانی خوا، ئەوەیە کە ئینسان لەسەر گەل و نیشتمانی بکاتەوەو، دژی داگیرکەرو چەوسێنەر بجەنگێ، لەخاڵی دووەمیشدا زیاتر تیشك داوێینە سەر ئەم مەسەلەیە.



---

(١) لەکتێبی (سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم..)دا، ئەم باس و بابەتانە جوانتر ڕوون کراوەتەوە، بڕوانە: چاپی چوارەم: ٢٠١٩ز




## پێشمەرگەی ئیسلام ئامانجی چیە؟

خوای زانا کەباسی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات خوا لێیان ڕازی بێ، دەفەرمووێ:

﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَانًا ...﴾ (الفتح: ٢٩)

واتە: بەخشش و ڕەزامەندیی خوا داوا دەکەن.

ئنجا لەڕاستی دا ئامانج و مەبەستی هەموو مسوڵمانێک، بریتیە لەوەدەست هێنانی بەخشش و ڕەزامەندی خوا، پێشمەرگەی ئیسلامیش کە نەک هەر مسوڵمانە، بەڵکو مسوڵمانێکی موجاهیدیشە، دیارە ئەویش هەرهەمان ئامانج و مەبەستی هەیە. بەڵام لێرەدا مەسەلەیەك هەیە، زۆر کەس تێیدا بەهەڵەدا چووە و پێویستیی بە ڕوونکردنەوەو توێژینەوەیە:

ئەویش ئەوەیە، کە وشەی (ئامانج) و (بەرهەم)یان (هاندەر)و (ئەنجام) تێکەڵ دەکەن و، وەک چێشتی مجێور، لێکیان دەدەن و فەرقیان پێ ناکەن.




بەڵام لەڕاستی دا هەرکام لە (ئامانج و هاندەر) و (بەرهەم و ئەنجام) هێندەی ئاسمان و زەوی لێک دوورن! چونکە ئامانج یان هاندەر، ئەو شتەیە کە دەبێتە بزوێنەرو پاڵنەری ئینسان بۆ جووڵان و بەرهەم و ئەنجامیش ئەوەیە، کە بەهۆی کارکردنەوە، وەدەست دێ.

ئامانج و مەبەستی پێشمەرگەی ئیسلام و، ئەو پاڵنەرو هاندەرەی وای لێدەکات: خۆی بەخت بکات و، ڕەنج بدات و ئارەقە و خوێن خەرج بکات، بریتیە لە خولیا و هیوا و ئاواتی گەیشتن بە ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی بەرین. بەڵام ئەوبەرهەم و دەستکەوتەی کە پێشمەرگەی ئیسلام وەدەستی دێنێ لە ئەنجامی خەبات و تێکۆشان و ڕەنج دانیدا، بریتیە لە نەهێشتنی حوکم و دەسەڵاتی کوفر و، لابردنی زوڵم و زۆر و خراپەکاری و بێدادیی و، بنیاتنانی حوکم و قەوارەی ئیسلامیی و، چەسپاندنی دادگەریی و چاکەکاری و ئازادیی لەپێشدا لەنێو نەتەوەی خۆی و نیشتمانی خۆی داو ئنجا لە باقی پارچەکانی دیکەی سەرزەوی دا.

بەکورتی: پێشمەرگەی ئیسلام، هیوا و ئاوات و ئامانج و مەبەستی بووژاندنەوەی ڕێ و شوێنی پێغەمبەرو هێنانەوەی ئیسلامە و، تاقە شتێک، کە وای لێدەکات خۆی بەخت بکات، وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا و پاداشتی نەبڕاوەیەتی، بەهۆی هەوڵ و خەبات و تێکۆشانییەوە، لەپێناوی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام و، هێنانەوە کایەی یاساو دەستوورەکانی دا.

ئنجا بەرهەم و ئەنجامێک کەلە سۆنگەی ئەو هەوڵ و خەباتەوە کە دەیکات، پێی دەگات، بریتیە لەلابردنی ستەم و خراپەکاریی و چەوساندنەوەو بێ دادیی و، هێنانەوەی خێرو خۆشیی و دادگەریی و

چاکەکاریی و ئازادیی. لەم برِە توێژینەوەیەشەوە، دەگەینە ئەنجامێکی گرنگ: ئەویش ئەوەیە کەبە ئامانج گەیشتنی پێشمەرگەی ئیسلام بەپێچەوانەی غەیری خۆیەوە، هەموو دەمێ مسۆگەرە، بەرهەم و ئەنجام وەدەست بێنێ یان نا!! چونکە ئامانج و مەبەستی پێشمەرگەی ئیسلام لە جوغزی ئەم ژیانە دنیاییەدا نیە و، بەوەدەست هێنانی بەرهەم و دەستکەوتەکانیشییەوە پەیوەست نیە!! بەڵام پێشمەرگەی غەیری ئیسلام، لەبەرئەوەی جگە لە مەبەستە دنیاییەکان، ئامانج و مەبەستێکی دیکە شك نابات، هەرکاتێک نەیتوانی دەست بگەیەنێتە ئەو ئامانج و مەبەستانە، کە پێشمەرگەی ئیسلام بەئەنجام و بەرهەمیان دەزانێ، مانای وایە بەئامانج نەگەیشتوە و، رەنج بەخەسارو دەسخەرِۆ بووە!!

لەکۆتایی ئەم باسەدا ئایەتێکی قورئان دێنینەوە، کە هەرکام لە ئامانج و بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشانی پێشمەرگەی ئیسلامی کۆکردوونەوە، خوا فەرموویەتی:

﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ...﴿٧٥﴾﴾ (النساء: ٧٥)

واتە: ئەوە بۆچی لەرِێی خواو چەوساوان دا ناجەنگن..؟! ئاشکرایە کە جەنگ کردن لەرِێی خوادا، مەبەست بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام و چەسپاندنی یاسا و دەستوورەکانیەتی، ئەمەش ئامانج و مەبەستی پێشمەرگەی ئیسلامە، جەنگ کردن لەپێناوی چەوساوان دا مەبەست قوتارکردن و رِزگارکردنیانە لەدەستی چەوسێنەران، دیارە ئەمەش میوەو بەرهەمی درەختی (جیهادی ئیسلامیی)یە.

**مادام وابێ شیله و کاکڵی ئەم باسە ئەوەیە:**

ئامانج و مەبەستی تێکۆشانی پێشمەرگەی ئیسلام، ڕەزامەندیی خواو بووژاندنەوەی ئیسلامە و، ئەنجام و بەرهەمی ئەو تێکۆشانەش، لابردنی حوکمی نەفامیی و چەسپاندنی چاکەکاریی و دادگەریی و ڕزگارکردنی چەوساوانە، لەو واقیعە پیس و نزم و زەبوونەی کە طاغووتەکان هێناویانەتە دی.




## مسوڵمانی موجاهید لەبواری خواپەرستیی دا

وەک لەبەرگی یەکەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا خستوومانەتە ڕوو، هەموو جم و جووڵ و چالاکییەکانی مرۆڤی مسوڵمان بەخواپەرستیی (عبادة) لەقەڵەم دەدرێن، بەمەرجێك: خوا مەبەست بوون (ألإخلاص) و بەپێی شەرع و سوننەت بەڕێوەچوونیان لەگەڵ دابێ، کەواتە: خواپەرستی لە ڕوانگەی پێشمەرگەی ئیسلامەوە، تەنها بریتی نیە لە نوێژ و ڕۆژ و زەکات و حەج و زیکر، بەڵکو ئەمانە دروشم و هێڵە سەرەکییەکانن و، خواپەرستیی دەر و دەروون (ظاهر وباطن)ی مرۆڤ و، ورد و درشتی ژیانی و، هەموو لایەنەکانی ئیسلام دەگرێتەوە.

جا ئێمە لەبەر ئەوەی سوپاس بۆ خوا لە مەوسووعەی: {خوا پەرستیی ئیسلامیی}دا[1] بەتێر و تەسەلیی باسی جۆر و چۆنیەتی خواپەرستی مرۆڤی مسوڵمانانمان کردوە، خوێنەر حەواڵەی وێ دەکەین و، بەپێویستی

---

(١) کە چاپی چوارەمی لە چوار بەرگ دایە.

نازانم ئەوەی لەوێ گوتوومە، دووبارەی بکەمەوە، بەڵام لێرەدا چوار ئامۆژگاریی گرنگ بۆ پێشمەرگەی ئیسلام دەخەمەڕوو:

## ١ـ تەنها خوا مەبەست بوون (الإِخلاص):

یەکەمین ئامۆژگاریم بۆ پێشمەرگەی ئیسلام، ئەوەیە کە لەپێش بەجێ هێنانی هەر ئەرکێکی ئایین و، ئەنجام دانی هەر فەرمانێکی خوا، دڵی خۆی بۆ خوا یەکلا بکاتەوە و، تەنها ڕازیی کردنی خوای مەبەست بێ، چونکە ئەگەر وانەبێ دەبێتە سەپانی پووشێ و لە ماندووبوونێ بەولاوە، هیچی دیکەی پێ نابڕێ و، بگرە زۆریشی لەسەر قەرزار دەبێتەوە، بەکورتیی: هەرکار و ئیشێک ئیخلاصی لەگەڵدا نەبێت وەك گەنمی کوێروو لێدراو، بنە تۆوی خۆی ناکاتەوە.

خواش فەرمموویەتی: ﴿ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢ ﴾ (الزمر:٢).

واتە: دەجا خوا بپەرستە و بەندایەتیی خۆتی بۆ یەکلابکەوە..

جا لەبەر ئەوەی جارێکی دیکەش دێینەوە سەروکاری ئەم باسە، بەم ئەندازەیە واز دێنین.

## ٢ـ بەپێی سوننەت و شەرع بەڕێوەچوون:

دووەمین ئامۆژگاریم ئەوەیە، کە ئامان! بەموو لە ڕێ و شوێن و سوننەتی پێغەمبەری ڕابەر (صلى الله عليه وسلم) لانەدەی، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ (الأحزاب:٢١)

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی چاک هەیە بۆ ئێوە.. دیسان خوا دڵنیای کردووین، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)لە هەڵە و تاوان پارێزراو (معصوم)ە و، لەخۆیەوە نادوێ و لەلایەن خواوە قورئانی بۆ هاتوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣ ﴾ (النجم: ٣)

بەڵام سەبارەت بەهیچ کەسی دیکە، ئەو جۆرە متمانە پێ بوون و لێ دڵنیابوونەی نەختسووینە بەردەست.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە فەرموویەتی: (مَنْ أَحْدَثَ في أَمْرِنا هذا ما لَيْسَ مِنْهُ فَهُو رَدٌّ..) (أخرجه البخاري برقم: ٢٦٩٧، ومسلم برقم: ١٧١٨، عن عائشة (رضي الله عنها)).. واتە: هەرکەسێک لەم ئایینەمان دا، شتێك دابێنێ کە لەوی نەبێ، ئەوە ڕەت کراوەیە..

## ٣- ورد و درشت لەلا گرنگ بوون:

ئامۆژگاریی سێیەمم ئەوەیە، کە نەچی بەس بەو فەرمانانەوە پابەند بێ کە فەڕزو پێویستن و، سوننەت و وردە بابەتەکان پشت گوێ بخەی، چونکە هەر وەک چۆن جوانیی و ڕێك و پێکیی ئینسان، چەندە لەسەرو گەردن و بەژن و باڵاو دەست و لاق و شان و پیل و چاوی دایە، هێندەش لەپرچ و نینۆک و برژانگ و برۆ و





پەنجە و لێوانی دایە، جوانیی و ڕێك و پێكیی ئیسلامیش، چەندە لە ئەرك و فەرمانە فەرز و بنەڕەتییەکانی دایە، هێندەش لەو سوننەت و وردە بابەتە جۆرا و جۆرانە دایە، کە ڕێکخەر و تەواوکەری ئەرک و فەرمانە سەرەکیی و بنەڕەتییەکانن، بەڵام دەبێ وریا بین و، لەڕووی جێ بەجێ کردن و گرنگیی و بایەخ پێدانەوە حەکیمانە لەگەڵ فەرز و سوننەتەکان دا، مامەڵە بکەین و، هیچ کات سوننەت پێش فەرز نەخەین و، لەبەر جێ بەجێ کردنی سوننەتێک شتێکی فەرز و گەورە فەرامۆش نەکەین.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام، هەمووو شتێکی بەرنامەی خوای لەلا گرنگ و بایەخدارە، چ ورد بێ چ درشت، چونکە درشت جێی خۆی دەگرێ و، وردیش جێی خۆی و، هیچ کامیان کەلێنی ئەوی دیکە پڕ ناکەنەوە.

## ٤- چێژ وەرگرتن و شەیدا بوون:

ئامۆژگاریی چوارەم و کۆتاییم بۆ پێشمەرگەی ئیسلام ئەوەیە، کە هەوڵ بدات: خوا پەرستی و بەندایەتییەکەی، لەڕووی ڕەغبەت و خۆشەویستییەوە ئەنجام بدات و تام لە خوا پەرستیی و بەندایەتییەکەی بکات، چونکە گەورەترین میوە و بەرهەمی درەختی بڕوای تەواو، ئەوەیە کە ئینسان تام و چێژ لە و ڕاز و نیاز و خزمەت و خواپەرستیی و جم و جووڵ و چالاکییە، وەردەگرێ کە لەپێناوی خوادا ئەنجامی دەدات، بەپێچەوانەوەش تەنبەڵی و قاڵب گرانیی و چێژ وەرنەگرتن و،

سارد و سڕیی نیشانەی دڵنەخۆشیی و بڕوا دانەمەزرانە، وەك خوا دەربارەی دەغەڵەکان فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾﴾ (النساء: ١٤٢).

واتە: بێگومان دەغەڵەکان ـ بەخەیاڵی خۆیان ـ خوا هەڵدەخەڵەتێنن بەڵام ئەم ئەوان هەڵدەخەڵەتێنێ و، کاتێک بۆ نوێژێ هەڵدەستن، تەوەزەلانە هەڵدەستن، ڕووپامایی خەڵکی دەکەن و بەدەگمەن نەبێ باسی خوا ناکەن.

ئنجا هەرچەندە ئەو تام و چێژ وەرگرتن و ڕەغبەت و خۆشەویستی هەبوونە، شتێکی ون و شاراوەیە و جگە لە خاوەنەکەی کەس هەستی پێ ناکات، بەڵام چەند نیشانەیەکیشی هەن کە دەبنە بەڵگەی هەبوونی وەك: حەز کردن لە زۆرمانەوە لە ڕکوع و کرنووش دا و، قوڕئان خوێندنی پاش فاتیحە و، زیکر و تەسبیحاتی پاش نوێژ و بەجێ هێنانی فەرمانەکان لەکات و جێی تایبەتی خۆیان دا و، خۆشحاڵ بوون بە نیزیک بوونەوەی کاتی ئەو خواپەرستییانە، وەك نوێژ، ڕۆژوو، غەزا، حەج،...هتد.




## خەسڵەتە پەسندەکانی پێشمەرگەی ئیسلام

وەک لە مەوسووعەی: (ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی)دا ڕوونمان کردۆتەوە: ڕەوشتی بەرز و سیفەتە پەسندەکان، بەرهەم و میوەی درەختی خواناسین و خوا پەرستیین، کەواتە پێشمەرگەی ئیسلام کە خاوەنی بڕوایەکی قووڵ و دامەزراوە، بە ئەندازەی قووڵیی و دامەزراویی بڕوایەکەی، ڕەوشت و خەسڵەتە پەسندەکانیشی، تێدا دێنەدی.

جا ئێمە بۆ چاکتر ڕوونکردنەوەی مەبەست لەم خاڵەدا، تەنها باسی ئەو خەسڵەتە بەرز و پەسەندانە دەکەین، کە پەیوەندییان بە زاتی مرۆڤەوە هەیە، وەك (تاك)ێك و، لەخاڵێکی دیکەش دا، باسی ئەو ڕەوشت و خووە بەرزو دڵگیرانە دەکەین کە وەک تاکێکی نێو کۆمەڵگا، پەیوەندییان بە مرۆڤەوە هەیە و مرۆڤی مسوڵمان بەشێوەیەکی ڕاست و ڕوا، بە کۆمەڵ و دەوروبەریەوە دەبەستنەوە.

بێگومان ئەو خەسڵەتە پەسەندانەش، کە لە ئەنجامی بڕوا و خواپەرستییەوە، لە پێشمەرگەی ئیسلام دا دێنەدی، یەکجار زۆرن،

بەڵام ئێمە لێرەدا گوڵبژێرێکیان دەکەین و، ئەوانەیان کە سەرەکیی و بنەڕەتیین[١] دەیان خەینەڕوو.

## ١- گەڕانەوە بۆ لای خوا (التوبة) :

مەبەستمان لە گەڕانەوە بۆ لای خوا، بەس ئەوەندە نیە کە بەزار بگوترێ: (أَسْتَغفِرُالله وأَتُوبُ إِلَيْهِ)، چونکە ئەمە قسە و دەعوایە، کە ڕاست و درۆیان هەڵدەگرێ و، پەرێز و بەرهەمیش بەلای یەکێکیانی دا دەخات!

بەڵکو مەبەستمان لە گەڕانەوە (التوبة) ئەوەیە، کە بابای مسوڵمان، دایم و دەردەم چاودێری خۆی بێت و، نەیەڵێ شەیتان هەڵیخلیسکێنێ و، ئەگەر جاروباریش زەفەری پێ برد، یەکسەر واز لەتاوان و خراپەکەی بێنێ و، لێی پەشێمان بێتەوە و، بە کردەوە بگەڕێتەوە سەرخەت و ڕێبازی خوا.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی گەڕانەوە لای خوا فەرموویەتی: (يا أَيُّها الناسُ تُوبوا الى اللهِ وآسْتَغْفِروْ فأنّي: أتوبُ في اليوْمِ مِأةَ مَرَّةٍ) (أخرجه أحمد برقم: ١٧٨٨٣، ومسلم برقم: ٧٠٣٣ واللفظ لأحمد).

---

(١) لەڕاستییدا هەرکام لە: (توبة) و (تقوى) و (إخلاص) و(زهد) و (شجاعة) و.. هتد هەڵدەگرێ کتێبێکی سەربەخۆیان لەسەر بنووسرێ، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەو دەرفەتەمان نیە و بابۆ داهاتوویێ و وەسوپاس بۆ خوا، لەکتێبی:(ڕێگای صالح بوون..)دا، تاڕاددەیەکی باش ئەو مەسەلانە توێژراونەوە، بڕوانە: چاپی پێنجەم/٢٠١٢ز.
هەروەها لەکتێبی: (گەڕانەوە بۆ لای خوا)دا، بڕوانە: چاپی پێنجەم/٢٠١٣ز.

واتە: ئەی خەڵکینە بگەڕێنەوە لای خوا و داوای لێبوردنی لێ بکەن، چونکە من ڕۆژی سەد جار دەگەڕێمەوە لای خوا..

## ٢- زانیاریی (العلم):

یەکی دیکە لە خەسڵەتە بەرز و پەسەندەکانی مسوڵمانی موجاهید بریتیە لە زانیاریی و شارەزایی، چونکە بەبێ زانیاریی و لێزانیی و چاوساغی هیچ شتێک جێی خۆی ناگرێ و، هیچ تیرێک نیشانە ناپێکێ، هەر بۆیەشە خوا لەهیچ شتێک دا فەرمانی بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نەکردوە، کە داوای لێ بکات: بۆی زیاد بکات، جگە لە زانیاریی:

﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴾ (طه:١١٤).

واتە: هەروەها بڵێ: پەروەردگارم! زانیارییم بۆ زیاد بکە.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام دەبێ، زانا بێ بەبەرنامەی خۆی، هەروەها زانا بێ بە ڕێچکە و کوێرە ڕێییەکان و، دوژمنان و دۆستان بناسێ، دەوروبەری بناسێ..هتد.

## ٣- پارێزکاریی (التقوی):

(راغب الأصفهاني) لە مانا لێدانەوەی وشەی تەقوادا گوتوویەتی: (وصار التقوى في اصطلاح الشرع حِفظُ النفس عمّا يُـؤْثِمُ)[١] (تەقوا لە

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص (٨٨١).

زاراوەی شەرع دا یانی: خۆپاراستن لە هەر شتێك، کە تاوانباریی تێدایە).

بەڵێ سێیەمین خەسڵەتی مسوڵمانی موجاهید، بریتیە لە خۆپاراستن لە تاوان، (التقوی) ئنجا بێگومان، هەروەك چۆن هەرکام لەنوێژ چواندن و ڕۆژوو خواردن و حەرام خواردن و، دەست درێژیی کردن، تاوان و خراپەن و دەبێ خۆیان لێ بپارێزێ، بەهەمان شێوەش، هەرکام لە: ڕوانینی حەرام و قسەی ناشیرین و، ڕاکردن لەبەر دوژمن و، نهێنیی نەپاراستن و، بێ فەرمانیی کردنی بەرپرسیش تاوان و خراپەن و، بابای پارێزکار دەبێ خۆییان لێ بپارێزێ، بەکورتیی: (تەقوا) یانی خۆپاراستن لەهەرچی بێ شەرعییە، بەردووک باری ئیجابیی و سەلبیی دا.

## ٤- تەنها خوا مەبەست بوون (الإِخلاص):

وەك پێشتر گوتمان: تەنها خوا مەبەست بوون، لەهەر ئیش و کارێکدا، مەرجی دروست بوون و وەرگیرانی ئەو کارەیە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((إِنَّما الأَعْمالُ بالنيّات وإنّما لِكُلِّ آمريءٍ مانَوى.)) (أخرجه البخاري برقم: ١، ومسلم برقم: ١٩٠٧ عن عمر (رضي الله عنه))..

واتە: بێگومان ـ وەرگیران و وەرنەگیرانی ـ هەموو کردەوەیەك- ی باش ـ بەس بە گوێرەی نیاز و مەبەستە و، بێگومان هەموو مرۆڤێک بەپێی نیاز و مەبەستی، حیسابی لەگەڵ دەکرێ.

شاعیرێکی فارسیش گوتوویەتی:

| | |
|---|---|
| عبادت به إخلاص نيّت نيكو است | وەگرنه چ آيد زبی مغز پوست |
| أگر جز به حق ميرود جـــــادت | در آتش فشـــانند سجاده ات |

واتە: خواپەرستیی بەنیاز و مەبەستی ساغەوە، چاکە، دەنا توێکڵی بێ کاکڵ، چی لێ پەیدا دەبێ؟! ئەگەر ڕێت بەلای غەیری خوادا بڕوات، بەرماڵەکەت لێ دەئاگری داوێن!

بەڵێ ئیخلاص و خوا پێ مەبەست بوون، ڕووح و کاکڵی هەموو کردەوە و چالاکییەك و، هەوێنی مەیینی هەموو شیرێکە و، بەبێ وی، هەموو گەنج و ڕەنجت بایی پوولێکە!!

کەواتە: هەروەک چۆن هیچ وەستایەک دەست بە دیوار دانان ناکات، هەتا بناغەکەی دانەڕێژێ، تۆش تاکو تەواو دڵنیا و مسۆگەر نەبی، کە جگە لە ڕەزامەندیی خوا، هیچ نیاز و مەبەستێکی دیکەت لە دڵ دا نیە، هیچ کارێك مەکە، ئەگەرنا نەك هەر هیچت پێ نابڕێ، بگرە زۆریش قەرزار دەبیەوە و، دووچاری سزا و تۆڵەش دەبی!

## ٥ـ پشت بە خوا بەستن (التوكُّل):

یەکی دیکە لە خەسڵەتە بنچینەییەکانی مسوڵمانی موجاهید، بریتیە لە پشت بەخوا بەستن و پاڵ وەخوا دان، هەڵبەتە پشت بەخوا بەستن، لە زۆر جێی قورئان و سوننەت دا، مەدحی کراوە، بۆ وێنە خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ﴾ (الطلاق: ٣)

واتە: هەرکەسێک پشت بەخوا ببەستێ، ئەوە ئەوی بەسە. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (مَنْ أَحبَّ أَنْ يكونَ أَقْوى النّاسِ فَلْيَتَوَكَّلْ عَلى اللهِ) (رواه إبن ابي حاتم).. واتە: کێ پێی خۆشە لە هەموو کەس بەهێزتربێ، با پشت بەخوا ببەستێت.

هەڵبەتە مەبەست لە پشت بەخوا بەستنیش، فڕێ دان و پشت گوێ خستنی هۆیەکان (إهمال الأسباب) نیە، وەك هەندێك کەس بەهەڵە، وا حاڵی بوون.[١]

## ٦ـ دنیا بەکەم گرتن (الزهد):

خۆشویستنی ژیانی دنیا و، هەڵبژاردنی بەسەر دواڕۆژدا، یەکێکە لەو خەسڵەتە بەدانەی، کە لە کافر و خوانەناسان دا، دێنە دی، خوای بێ هاوتا فەرموویەتی:

﴿ ...وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ۝٢ ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ ...۝٣ ﴾ (إبراهيم:٢-٣).

واتە: هاواریش بۆ کافران لە ئازارێکی توند، ئەوانەی ژیانی دنیا بەسەر دواڕۆژدا هەڵدەبژێرن.

---

(١) لە کتێبی (ڕێگەی صالح بوون و بەرەو خوا چوون) و کتێبی (گیانی ژیان) دا بەدرێژی لەو بارەوە دواوین.

بەڵام پێشمەرگەی ئیسلام، نەك هەر ژیانی ناکاتە ئامانج و مەبەستی هەرە بەرزی و، بەسەر ژیانی دوارۆژدا هەڵینابژێرێ، بەڵکو زۆریشی بەکەم دەگرێ، چونکە خوا فەرمووویەتی:

﴿...فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾﴾ (التوبة: ٣٨).

ڕابواردنی ژیانی دنیاش لەچاو دوا ڕۆژ، بەس شتێکی کەمە، چونکە ڕابەرەکەی فەرمووویەتی: (ما الدُّنْيَا في الآخِرَةِ، إلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ أُصْبُعَهُ فِي الْيَمِّ، فَلْيَنْظُرْ بِمَ يَرْجِعُ) (أخرجه مسلم برقم: ٢٨٠٥).. واتە: وێنەی دنیایە لەچاو دوارۆژ، وەك ئەو تۆزە ئاوە وایە، کە یەکێکتان قامکی دەخاتە نێو دەریاوە، ئنجا با سەرنج بدات، داخۆ چ بەپەنجەیەوە دێت!!

(واتە: ژیانی دنیا لەچاو دوا ڕۆژ، وەك ئەو تۆزە ئاوە وایە کە بەقامکییەوە هاتوە، لەچاو ئاوی دەریا) دنیا بەکەم گرتنی پێشمەرگەی ئیسلامیش لە زۆر شتاندا دەردەکەوێ بۆ وێنە: بەرگی سادە و هەرزان پۆشین و، بەتەنگ خواردن و خواردنەوە نەبوون و، بەرچاو تێریی و پارە کۆنەکردنەوە و، گوێ نەدانە مەدح و زەمی خەڵکی و...هتد[1].

---

(١) یەکێک لەزانایان دەربارەی (زُهد) جوانی گوتووە، کە دەڵێ: (ليس الزهد أن لاتملك شيئاً، بل أن لاّيملك شيءٌ) واتە: زوهد ئەوە نیە تۆ هیچ شتێکت نەبێ، بەڵکو ئەوەیە هیچ شتێك تۆی نەبێ!

## ٧- خۆ ڕاگریی (الصبر):

یەکی دیکە لە خەسڵەتە پەسەندەکانی مسوڵمانی موجاهید، بریتیە لە خۆڕاگریی، خۆڕاگیی (الصبر)یش وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (حَبسْ النفس على ما يقتضيه العقل والشرع)[١] واتە: (صبر) بریتیە لە حەبس کردنی نەفس لەسەر شتێك کە عەقڵ و شەرع دەیخوازن.

(عبدالقادر)ی گەیلانییش خوا لێی خۆشبێ، گوتوویەتی: خۆڕاگریی سێ بەشە:

(أ)- خۆڕاگریی لەسەر فەرمانبەریی (الصبر على الطاعة)،

(ب)- خۆڕاگریی لەسەر تاوان نەکردن (الصبر عن المعصية)،

(ج)- خۆڕاگریی لەسەر بەڵاو گیروگرفت (الصبر على البلاء)،

هەروەها دەتوانین بە شێوەیەکی دیکەش، خۆڕاگریی دابەش بکەین و بڵێین: خۆڕاگریی سێ بەشە:

أ- خۆڕاگریی لە ئاقار داخوازییە خراپەکانی نەفس دا.

ب- خۆ ڕاگریی لە ئاقار دنەدان و خوت خوتەی شەیتان دا.

ج- خۆڕاگریی لە ئاقار دوژمنان دا کە (رباط)ی پێ دەگوترێ.

ئەم ئایەتەش هەرسێکیانی کۆکردونەوە:

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، ص (٤٧٤).

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٢٠٠ ﴾.

واتە: ئەی بڕوادارینە! خۆڕاگربن لەئاقار شەیتان دا و، خۆتان ڕابگرن لە ئاقار دوژمنان دا و، سەنگەرێ بگرن و، پارێز لە خوا بکەن بەڵکو سەرفرازبن.

## ٨- هەست کردن بە چاودێریی خوا:

یەکی دیکە لەو خەسڵەتە بەرزانەی، کە پێشمەرگەی ئیسلامیان پێوە دەناسرێ، بریتیە لەوەی، کە دایم و دەردەم هەست بە چاودێریی (مراقبة) و بەسەر ڕاگەیشتنی خوا دەکات و، دەزانێ کە خوا مێرووڵەی ڕەش، لەشەوی تاریک دا، بەسەر بەردی ڕەشەوە دەبینێ و، چرپەی مار و مێروو دەبیستێ و، هەست بە سیلەی چاوو خورپەی دڵ دەکات و، هیچی لێ ون نابێ، وەك فەرموویەتی:

﴿ ....وَمَا يَخۡفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ٣٨ ﴾
(إبراهيم:٣٨)

واتە: هیچ شتێک لە خوا ون نابێ، نە لە زەوی و نە لە ئاسمانێ دا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ...)) (أخرجه أحمد برقم: ٢١٣٩٢، والترمذي برقم: ١٩٨٧، وقال حديث حسن صحيح، عن أبي ذر)..

واتە: لەهەر جێیەك بووی و لە هەرحاڵێك دا بووی، پارێز لە خوا بکە.




## ڕەوشتی مسوڵمانی موجاهید لەگەڵ خەڵکی دا

ئەو خوو ڕەوشتە بەرزانەی، کە پێشمەرگەی ئیسلامیان پێوە دەناسرێن، لە بواری مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، زۆر و جۆراو جۆرن، بەڵام لێرەدا مەودای باسکردنی هەموانیانمان نیە و، بەس گوڵبژێریکیان دەکەین:

### ١ـ سوود بە خەڵک گەیاندن:

گەورەترین و بنەڕەتییترین، ڕەوشتی پێشمەرگەی ئیسلام، بریتیە لەوە: کە ئەوەندەی بۆی بلوێ، سوود بەخەڵکی دەگەیەنێ: بەدڵ، بەزمان، بەدەست، بەماڵ.. چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((خَيْرُ النّاسِ أَنْفَعهُمْ لِلناّسِ)) (أخرجه القضاعي في (مسند الشهاب) برقم: ١٢٣٤، عن جابر). واتە: چاکترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە سوود بەخشترە بۆ خەڵکی، خوای پەوەردگاریش فەرموویەتی:

﴿.... وَأَحْسِنُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ (البقرة:١٩٥)

واتە: .. هەروەها چکە بکەن، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن.

### ٢ـ ڕێز لە خەڵکی گرتن:

پێشمەرگەی ئیسلام، لە سۆنگەی ئەوەوە کە بۆخۆی خاوەنی ڕێز و حورمەتە، ڕێز و حورمەتی هەموو کەسێکی لەلایە و، هەرگیز شتێکی وا پێشان نادات کەسایەتیی هیچ کەسێکی پێ بڕووشێ و، هەوڵدەدات کە بەپەسەندترین و خۆشترین ناو بانگی هەر کەسێک بکات، چونکە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) وای پێ فەرمووە: (أدعوا الناس بأحبِّ أسمائهم إليهم).

### ٣ـ خۆ لەئیشی کەسەوە هەڵنەقورتاندن:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ، تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ)) (أخرجه الترمذي برقم: ٢٣١٨، عن أبي هريرة).. واتە: لەتەواویی و چاکیی مسوڵمانەتی مرۆڤ، ئەوەیە کە هەرشتێک پەیوەندیی بەویەوە نەبێ، خۆی تێ هەڵنەقورتێنێ.

بەڵێ خۆ لە ئیشی خەڵکییەوە هەڵنەقورتاندن و، لەهەموو دیزان نەبوونە ئەسکوێ، یەکی دیکەیە لە ڕەوشتە بەرزەکانی پێشمەرگەی ئیسلام، لە بواری هەڵس وکەوتی نێو کۆمەڵگا دا.

### ٤ـ زیان و قازانجی خەڵکی وەک هی خۆ حسێب کردن:

یەکی دیکە لە ڕەوشت و خووە پەسەندو هەڵبژاردەکانی پێشمەرگەی ئیسلام، ئەوەیە کە خۆشی و ناخۆشیی و، قازانج و زیانی مسوڵمانان،

وەك هی خۆی لەقەڵەم دەدات، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)پێی فەرمووە: ((لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ)) (أخرجه البخاري برقم: ١٣، ومسلم برقم: ٧١، عن أنس). واتە: یەکێک لەئێوە بڕوا ناهێنێ، هەتا چۆنی بۆخۆی پێ خۆشە، ئاواشی بۆ برایەکەی پێ خۆش نەبێ.[١]

## ٥ـ خەڵک بەسەر خۆدا هەڵبژاردن:

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە بەرز و پەسەندانەی، کە دەبێ مسوڵمانی موجاهید، هەوڵی خۆ پێ ڕازاندنەوەیان بدات، بریتیە لە: بەسەر خۆدا هەڵبژاردنی خەڵك (الإيثار)، هەڵبەتە تاق و لۆق نەبێ، ناگەنە لووتکەی بەرزی ئەم ڕەوشتە مەزنە ئیسلامیەی، کە خوا کردوویەتی بەمەدحی هاوەڵە هەڵبژاردەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەك دەفەرموێ:

﴿...وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾﴾ (الحشر:٩).

واتە: هەروەها خەڵکی بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن هەرچەندە بۆ خۆشیان پێویستییان هەبێ.

---

(١) وەك زانایان گوتوویانە مەبەست لە ئیمان لێرەدا، ئیمانی کامڵ و تەواوە نەك موتڵەقی ئیمان.

## ٦ـ نەرم و نیانیی و خۆ بەکەم گرتن:

خوای مەزن لەوەسفی هاوەڵانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ﴿ ... رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ... ﴾(الفتح:٢٩)، واتە:..لەنێو خۆیاندا میهرەبان و بە بەزەیین..

هەروەها لە جێیەکی دیکەدا، لە وەسفی ئەو مسوڵمانە هەڵبژاردانەدا، کە بەرنامەی خۆیان پێ دەبووژێنێتەوە، فەرموویەتی:

﴿ ... أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ... ﴾ (المائدة:٥٤).

واتە: .. لە ئاقار بڕواداران دا گەردن کەچن.

بەڵێ، یەکی دیکە لە خو و ڕەوشتەکانی پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ خەڵکی مسوڵمان دا، بریتیە لەنەرم و نیانی و سینگ فراوانیی و، خۆ بەکەم زانیی، هەڵبەتە مرۆڤیش بە خۆ کەمگرتن لە بەرانبەری بڕواداراندا، گچکە نابێتەوە و لێی دانالەنگێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە: پێی بەرز دەبێتەوە وەک پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((وَمَا تَواضَعَ أَحَدٌ لِلّهِ إِلّا رَفَعَهُ الله)) (أخرجه مسلم برقم: ٦٩، عن أبي هريرة) واتە: هەرکەسێک لەبەر خوا خۆی بەکەم بگرێ، خوا بەرزی دەکاتەوە.

## ٧ـ پاراستنی ئەندامەکان:

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە پەسەندانەی، کە پێشمەرگەی ئیسلام لەبواری پەیوەندیی لەگەڵ خەڵکی دا، ڕەچاویان دەکات، بریتیە لەوەی

کە هەموو ئەندامە پەنهان و ڕواڵەتییەکانی دەپارێزێ، لەوەی کە بەشێوەیەك بەکاریان بێنێ، زیانی مسوڵمانانی تێدابێ.

بەڵێ مسوڵمانی موجاهید، ئەندامەکانی ناکاتە دڕندە و سەگی هار و لە بەلەکی خەڵکیان بەرنادات، بەڵکو بە جڵەوی عەقڵ و شەرع ڕێشمەیان دەکات و لەواشەیان دەکات و ناهێڵێ خەتێ خوار بکەن:

١- زمانی لە درۆ و، غەیبەت و، بوختان و، توانج و، پللار و ناووناتۆرە و، جنێوو، خۆ بەسەر خەڵکی دا هەڵکێشان و، دووزمانیی و جاسووسیی و.. هتد دەپارێزێ.

٢- گوێی لەبیستنی هەموو قسەیەکی خراپ و بێ شەرعیی دەپارێزێ، بەتایبەتی کە زیانی مسوڵمانێکی تێدابێ، مەگەر لەچەند حاڵەتێکی هەڵاوێراودا کە بەرژەوەندی مسوڵمانانی تێدابێ.

٣- چاوی لە هەموو ڕوانینێکی خراپ و بێ شەرعی دەپارێزێ و لەشتی حەڵاڵ و شەرعی دا نەبێ، بەکاری ناهێنێ.

٤- دڵی لەهەموو جۆرە گومان و خەیاڵێکی بەد و پیس دەپارێزێ سەبارەت بە هەرکام لە مسوڵمانان، هەرچەندە لەجێی خۆشی دا کە پێویست بکات ڕێ بەخۆی دەدات کە گومان بەکاربێنێ، چونکە زۆر جاران گومان ڕێی گەیشتنە هەق و ڕاستییە.

٥- هەروەها دەست و لاقی، لەهەموو کردار و ڕەفتارێکی خراپ دەپارێزێ.

٦- دیسان گەدەی لەهەموو پاروویەکی حەرام دەپارێزێ و..هتد.

## ٨ ـ ڕەفتاری مسوڵمانی موجاهید لەگەڵ نا مسوڵماناندا:

بەڵام هەڵوێست و ڕەفتاری پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ نا مسوڵماناندا، لەمەی ڕابرد جۆێیە و بەکورتی دوو جۆرە:

١) ئەگەر لەحاڵەتی بانگەواز کردن و تێگەیاندنیان دا بێ، ئەوە ئەوپەڕی نەرمیی و هێمنیی و لێزانیی و پشوو درێژیی، بەکاردێنێ، چونکە خوا فەرموویەتی:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ ...﴿١٢٥﴾ ﴾ (النحل:١٢٥).

واتە: بانگەواز بکە بۆ لای ڕێی پەروەردگارت بە لێزانیی و وەستایی و ئامۆژگاریی چاك..

دیسان خوا کە مووسا و هاڕوونی برای (علیهما السلام) ناردە لای فیرعەون بۆ تێگەیاندن و بانگ کردن پێی فەرموون:

﴿ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا ... ﴾ (طه: ٤٤).. واتە: قسەیەکی نەرمی لەگەڵ بکەن..

ب) بەڵام ئەگەر لە حاڵەتی ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگ و بەرەنگاری دا بێ، ئەوە خوا فەرموویەتی:

﴿ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ ﴾ (الفتح: ٢٩) واتە: لەسەر کافران توند و تیژن.

دیسان بە پێغەمبەری فەرمووە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ ... ﴿٧٣﴾ ﴾ (التوبة:٧٣).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا، لەگەڵ کافر و دەغەڵەکان دا بجەنگە و ڕەقییان بەرانبەر بنوێنە، هەروەها خوای زانا پێمان دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾ (التوبة:١٢٣).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگن کە لێتانەوە نێزیکن و، با ڕەقییتان پێوەببینن و، بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە.

بەڵێ لەحاڵەتی بەرەنگاربوونەوەدا، پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ دوژمنانی دا هەتا پێی دەکرێ، دڵڕەق و بێ بەزەیی بێ و، شێری چنگ بەخوێن بێ و، زەبری وایان لێ بدات، کە ئەگەر لەهی پێشەوەیان بدرێ ئەوەی لە دواوەیانە، پێی تەمبێ خواردوو بێ و، زراوی بچێ، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾﴾ (الأنفال:٥٧).

واتە: ئنجا هەرکات لە جەنگدا زەفەرت پێبردن، زەبری وایان لێ بدە، کە ئەوانەی لە دوایانەوەن پێی پرژ و بڵاوبن، بەڵکو پەند وەربگرن!!

بەڵام نابێ لەم قسانەش ئەوە بفامرێتەوە، کە ئینسانی مسوڵمان لەکاتی جەنگ و جیهاد دا بۆی هەیە لەسنوورەکانی شەرع و ئەدەبە بەرزەکانی دەربچێ، وەك دوایی لە خاڵی شەشەم (ڕەوشتە جیهادییەکانی مسوڵمانی موجاهید)دا باسی دەکەین.




## ڕەوشتە جیهادییەکانی مسوڵمانی موجاهید

بێجگە لەو خەسڵەت و ڕەوشتە بەرز و جوانانەی، کە لەخاڵی چوارەم و پێنجەم دا، خراونە ڕوو، پێشمەرگەی ئیسلام، لەڕووی جەنگاوەرییەوە خاوەنی ئەم سیفەت و ڕەوشتە بەرزانەشە:

### (١) جەنگ کردن تەنها بەمەبەستی ڕەزامەندیی خوا و بەهەشتی بەرین:

چەک هەڵگرتن و جەنگ کردن، بەس بەمەبەستی ڕازییکردنی خوا و، شادبوون بەبەهەشتی ڕازاوە و نەبڕاوە و خۆ پاراستن لە کاریگەریی هەر جۆرە دەمار و هەست و نەست و هاندەرێکی دیکە وەک: مەدح و پێهەڵا گوتران و سەرنج ڕاکێشانی خەڵک و، دەمارگیریی و، تیرە و ناوچەگەرێتیی و، دەستکەوتی ماددیی.

چونکە - وەك پێشتریش باسمان کرد- ئیخلاص و بەس خوا پێ مەبەست بوون، مەرجی سەرەکیی وەرگیرانی هەر کردەوەیەکی باشە و،

خوا لەوە بەرز و مەزن ترە بە هاوبەشێتیی هیچ کەس و هیچ شتێک ڕازی بێت، وەك لەفەرمووودەیەکی قودسیی دا فەرمووویەتی: ((.. أنا أغنى الشركاء عن الشرك ، مَنْ عمِلَ عَملًا أشرك فيه معي غيري، تركته وشركه)) (رواه مسلم).

پێغەمبەری خواش(صلى الله عليه وسلم) دەربارەی ڕەنج بەخەساریی کەسێک کە بەپاڵنەری غەیری ڕەزامەندی خوا ـ بەڕواڵەت ـ لەپێناوی خوادا کوژراوە، فەرموویەتی: ((إن أول الناس يُقْضى يوم القيامة عليه رجل استشهد، فَأُتي به، فعرَّفه نِعَمَه فَعَرفها، قال : فما عملت فيها ؟ قال : قاتلت فيك حتى استشهدت . قال : كَذَبْتَ، ولكنَّك قاتلت لأن يقال جريء . فقد قيل، ثم أمر به فَسُحِبَ على وجهه حتى أُلقي في النار)) (أخرجه مسلم برقم: ١٥٢، عن أبي هريرة).

واتە: بێگومان یەکەمین کەس کە لە ڕۆژی دوایی دا حوکم دەدرێ پیاوێکە شەهید بووە! دەهێنرێت ـ بۆ دادگای خوا ـ و خوا چاکەکانی خۆی دەخاتە بەرچاوی، ئەویش دانیان پێدا دێنێ، پاشان ـ خوا ـ لێی دەپرسێ: ئایا چیت بەو نیعمەتانە کردوە؟ ئەویش دەڵێ: لەڕێی تۆدا جەنگاوم تاکو شەهید بووم، خوا پێی دەفەموێ: درۆت کرد، بەڵکو بۆیە جەنگاوی هەتا بڵێن: ئازا و بوێرە، ئەوەش گوترا، دوایی فەرمان دەکرێ و لەسەر ڕووی ڕادەکێشرێ، هەتا فڕێ دەدرێتە نێو ئاگر ـ ی دۆزەخ ـ دوە.

## (٢) جەنگ کردن لەژێر ئاڵای ئیسلام دا و، بەمەبەستی چەســپاندن و پــاراستنی حوکمــی خـــوا:

مەگەر چۆن دەنا هەرجارێک لە قورئانیٚ دا، باسی جەنگ و جیهاد کرابیٚ، وشەی لەڕێی خوادا [في سبيل الله]ی لەگەڵدایە، بۆ وێنە:

﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ ﴿١٩٠﴾ ﴾

(البقرة: ١٩٠).

واتە: لە ڕێی خوادا بجەنگن دژی ئەوانەی جەنگتان لە دژ دەکەن و، دەستدرێژی مەکەن.....

بەڵیٚ بێجگە لە ئیسلام(بەرنامەی خوا) هیچ شتێکی شایستەی ئەوەنیە کە ئینسانی مسوڵمان خوێنی خۆی بۆ بڕێژیٚ و سەری خۆی لەپێناودا دانیٚ، دیسان بێجگە لە ئیسلامیش، هیچ ئاڵاو دروشمێکی دیکە لەوە ناوەشێتەوە کە مسوڵمانی موجاهید لەژێر سایەی دا بجەنگیٚ و، لەسەر سەری خۆی بەرزی بکاتەوە، هەربۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان (صلی الله علیه) فەرموویەتی: ((وَمَنْ قَاتَلَ تَحْتَ رَايَةٍ عِمِّيَّةٍ يَدْعُو إلى عَصبَةٍ، أو يَغْضَبُ لِعَصَبَةٍ، فَقُتِلَ فَقِتْلَةٌ جَاهِلِيَّةٌ)) (أخرجه مسلم برقم: ١٨٥٠، وابن حبان برقم: ٤٥٧٩ عن جندب).

واتە: هەرکەسێک لەژێر ئاڵایەکی نامۆ و نەناسراودا بجەنگیٚ، بانگەواز بۆ دەمارگیریی بکات، یان لەسەر دەمارگیریی تووڕەبیٚ و، بکوژریٚ، ئەوە کوژرانێکی نەفامانە کوژراوە.

## (٣) خۆزگە نەخواستن بە ڕووبەڕوو بونەوەی دوژمن و لەبیـانوو نەبوون بـۆ جـەنگ:

بێگومان ئیسلام، جەنگ و کوشتاری وەك دوایین چارە و دەرمانی کۆتایی (وآخر الدواء الكي) داناوە و، لەکاتی ناچاریی دا نەبێ، پەنای بۆ نابات، بۆیە یەکێک لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی بابای موجاهید لەمەیدانی جەنگ و جیهاددا، ئەوەیە کەسەری بۆ جەنگ ناخورێ و خۆزگەی پێ ناخوازێ، بەڵام هەرکاتێک شەڕ و جەنگیش یەخەی گرت و، ناچاربوو بیکات، مەردانە دەیکات و پشوو درێژو خۆڕاگر دەبێ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((يا أيها الناس ، لا تتمنَّوا لقاء العدو، واسألوا الله العافية ، فإذا لقيتموهم فاصبروا)) (أخرجه البخاري برقم: ٢٨٠٤، ومسلم برقم: ١٧٤٢، عن عبدالله بن ابي أوفى). واتە: ئەی خەڵکینە! بەرنگاربوونەوەی دوژمن بەئاوات مەخوازن و، داوای سەلامەتیی لەخوا بکەن. بەڵام ئەگەر بەرەنگاریان بوونەوە خۆڕابگرن..

دیارە ئەم خەسڵەتەش، ئەوە دەخوازێ، کە هیچ موجاهیدێک کارێک نەکات و، بەجۆرێک ڕەفتار نەکات، کە سەربکێشێت بۆ جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دوژمن دا، لەکاتێک دا کە قیادەی باڵا بێ ئاگایە و، هیچ نەخشە و پلانی جەنگی نیە و، نایەوێ تووشی شەڕو جەنگ بێ، بێگومان هەرکەسێک ڕەفتار و هەڵوێستێکی تاکڕەوانە و خۆ بەسەرانەی وای لێ بپشکوێتەوە، کە ببێتە مایەی دروست کردنی هەراو کێشەیەکی نەویستراو و، نەخشە

بۆ نەکێشرا و، ئەوە ئۆباڵی دنیا و قیامەتی هەر زەرەر و زیان و کارەسات و مەینەتییەکی، لەئەستۆیە کە مسوڵمانان تووشی دەبن، دیارە ئەگەر قیادەش کەمتەرخەمیی و گوێ پێنەدانی هەبێ لەوبارەوە، ئەویش گوناهبارە و، بگرە گوناح و ئۆباڵی گەورەی دنیا و قیامەتی لەئەستۆدا دەبێ.

## (٤) ئازایەتیی و بێباکیی و پشت لەدوژمن نەکردن:

خوای زاڵ و باڵادەست، لە پێناسەی ئەو کۆمەڵە مسوڵمانەدا، کە ئایینی خۆییان پێ دەبووژێنێتەوە و، دێنێتەوە گۆڕەپانی ژیان، فەرموویەتی:

﴿... أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ...﴾ (المائدة:٥٤).

واتە: لەسەر بڕواداران نەرم و میهرەبانن و، لەسەر بێ بڕوایانیش زاڵ و بەدەمارن.

هەروەها خوای بەرز و مەزن، بەبڕوادارانی فەرمووە:

﴿...فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ (آل عمران:١٧٥).

واتە: ئنجا ئەی مسوڵمانینە! لەوان ـ کافران ـ د مەترسن و لەمن بترسن، ئەگەر بڕوادارن.

دەربارەی پشت لە دوژمن کردن و لەمەیدان ڕاکردنیش هەڕەشەی گەورە هەیە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((إجْتَنِبُوا السَّبْع المُوبِقاتِ..... وَالتَولِّي يَوْمَ الزَّحْفِ))(أخرجه البخاري برقم:

٢٧٦٦، ومسلم برقم: ١٤٥، عن أبي هريرة).. واتە: خۆتانی لەحەوت ـ تاوانە ـ فەوتێنەرەکان بپارێزن: .... پشتکردنە دوژمن لەڕۆژی هێرشدا.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ زَحۡفٗا فَلَا تُوَلُّوهُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ١٥ وَمَن يُوَلِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ دُبُرَهُۥٓ إِلَّا مُتَحَرِّفٗا لِّقِتَالٍ أَوۡ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٖ فَقَدۡ بَآءَ بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٦ ﴾ (الأنفال: ١٦).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکاتێک بەرەنگاری هێرشی ئەوانە بوون کەبێبڕوان، نەچن پشتیان تێ بکەن! هەرکەسێک لەو ڕۆژەدا پشتیان تێ بکات، مەگەر لەحاڵەتی وەرسووڕان بۆ تاکتیکی جەنگ، یان خۆ گەیاندنەوە بەدەستەیەک[1] (لە برایانی جەنگاوەری) ـ ئەوە بێگومان تووڕەیی خوای پێ بڕاوە و، جێگای دۆزەخە و، ئەوێش خراپترین سەرەنجامە.

---

(١) زانایان گوتوویانە: لەکاتێک دا هێزێکی ئیسلامیی، لەلایەن دوژمنەوە ئابڵووقە بدرێ و، توانا و برستی دەست کردنەوە و بەرگری لەخۆ کردنیشیان نەمابێ، دیسان ئەو جەنگاوەرانە بۆیان هەیە ڕابکەن و، مەیدانی جەنگ بەجێ بهێڵن، وەك (خالد بن الوليد)خوای لێ ڕازی بێ لەجەنگی (مؤتة)دا کردی، کە دواییش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)مەدحی کردن و فەرمووی: (بَلْ هُمُ الكَرَّارون إنْ شاَءاللهُ)، بڕوانە کتێبی (روائع البيان تفسير الأحكام من القرآن) محمد علي الصّابوني (ج١ص:٥٩٩).

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕووحم فیدای ڕێ و شوێنی بێت، لەجەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا ئازاترین و چاکترین و چاونەترسترین کەس بووە و، جەنگاوەرە ئازا و بەجەرگەکانی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ گوتوویانە: (کُفاً إذا حَمِيَ الوطِيسُ إحْتَمْينا بِرَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم)) واتە: ئێمە لەکاتێک دا کە تەندووری جەنگ گەرم دەبوو، خۆمان بەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ـ لەدوژمن ـ دەپاراست!!.

## (٥) پارێزکاریی و زۆر یادی خوا کردن:

بێگومان موجاهیدانی ئیسلام، پشتیان بەخوا قایمە و، هەرخوا بەتاقە پشت و پەنای خۆیان و جیهادەکەیان دەزانن، ئنجا بێگومان لەگەڵ بوونی خوا و پشتگیری کردنی بۆ مسوڵمانان هەروا بەگۆترە نیە و، لەسەر بناغەیەکی وردی دادگەرانەیە و، بەئەندازەی لەگەڵ خوادا بوونی بڕواداران و بەندایەتییانە بۆ خوا، کە لە پارێزکاریی و زۆر یادی وا کردنیان دا، دەردەکەوێ، یان چاکتر بڵێین: کەپارێزکاریی (تقوی) و یادی خوا (ذکر الله) فراوانترین دروشمنی.

خوای پەروەردگار لەوبارەیەوە فەرمووییەتی: ﴿...فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾ (البقرة:١٩٤).

واتە: ئنجا هەرکەسێک دەستدرێژیی کردە سەرتان، دەستدرێژیی بکەنەوە سەر، وەك ئەو دەستدرێژییەی کە کردوویەتە سەرتان و، پارێز لەخوا بکەن و بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە.

وەك دەبینین: خوای دادگەر لەگەرمەی جەنگ و جەنگی بەرپەرچ دانەوەی ستەم و دەستدرێژیی بێ بڕوایان دا، زۆر بەتەئکیدەوە فەرمان بە پارێزکاریی دەکات و، ئاگاداریشمان دەکاتەوە، کە لەگەڵ پارێزکاران دایە!.

دیسان خوای پەروەردگار و تۆڵەئەستێن فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةً فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾ (الأنفال:٤٥).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەرکاتێک بەرەنگاری کۆمەڵک بوون، چەسپاو بن و، زۆر یادی خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن (لێرەدا مەبەست لەسەرفرازیی، زاڵبوون و سەرکەوتنە بەسەر دوژمن دا).

بەڵێ لە ڕاستیی دا جەنگ بەرلەوەی بەچەک و هێزی ماددیی بکرێ، بەهێزی دڵ و دەروون و مەعنەوییات دەکرێ و، چاکترین و گەورەترین سەرچاوەی هێز و وزەی دڵ و دەروونیش، پەیوەندیی توند و تۆڵە لەگەڵ خوادا، ئنجا بێگومان پارێزکاریی و یادی خوا کردنیش، چاکترین و فراوانترین هۆکاری پتە و بوون و قووڵ بوونەوە و قایم بوونی ئەو پەیوەندییەن.

## (٦) ڕەقیی و زبریی و توندوتیژیی:

هەروەک چۆن هێدیی و مەندیی و، نەرم و نیانیی و، سینگ فراوانیی و، کارامەیی و لێزانیی شێواز و دەستووری هەڵس و کەوت و ڕەفتارە، توند وتیژیی و زاڵیی و زبریی (الشِّدَّة والعِزَّة)یش، شێواز و چۆنیەتی ڕەوشت و ڕەفتاری جەنگاوەرانە، دیاریی دەکەن، وەک خوای کاربەجێ و باڵادەست و زاڵ فەرموویەتی:

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ ... ﴿٢٩﴾ ﴾ (الفتح:٢٩)

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ... ﴿٥٤﴾ ﴾ (المائدة:٥٤).

ویان فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾ (التوبة:١٢٣).

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەگەڵ ئەو کافرانەدا بجەنگن کە لێتانەوە نیزیکن و با زبرییتان پێوە بەدی بکەن و، بزانن کە خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە.

بەڵێ وەك پێشینان دەڵێن: (کەس لەشەڕ شەکری نەبەشیوەتەوە).

ئەو کەسەی کە دوژمنتە و، بەخوێنی سەرت تێنوویە و، ئەگەر زەفەرت پێ ببات، جەبت نادات و پەل پەلت دەکات، هیچ ماقووڵ نیە، تۆش بە شێوازی خۆی ڕەفتاری لەگەڵدا نەکەی و، هەر بەو زمانە نەیدوێنی، کە لە غەیری ئەوە حاڵی نابێ! هەر بۆیەش دەبینین پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) کە خوا لەبارەیەوە فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾ (الأنبياء:١٠٧)

سەبارەت بە کەسانێکی ئاوا، ڕێ ڕوونیی دەکات و فەرمانی پێ دەکات، کە بەم شێوەیە ڕەفتاریان لەگەڵ بکات:

﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَـٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِى كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِى ٱلْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾

(الأنفال: ٥٥،٥٦،٥٧).

واتە: بێگومان خراپترینی ژیانداران لەلای خوا، ئەو کافرانەن کە بڕوا ناهێنن، ئەوانەی کە پەیمانت لەگەڵ بەستوون، کەچی هەموو جارێ پەیمانەکەیان هەڵدەوەشێننەوە و، ئەوانە پارێز ناکەن ـ لەبێ بەڵێنیی ـ، ئنجا هەر کاتێک لەجەنگ دا، ئەوانەت بۆ هەڵکەوت ـ جەبیان مەدە و زەبرێکی وایان لێ بدە ـ ئەوانەی کەلە پشتیشیانەوەن پرژ وبڵاو و تاروماریان بکە، بۆ ئەوەی پەندگرتوو بن.

## (٧) پێش خستنی بانگەوازکردن بۆ ئیسلام لەسەر جەنگ و کوشتار:

پێویستە مسوڵمانانی موجاهید، لەگەڵ هەر پێڕو کۆمەڵێک دا بجەنگن، بەر لەدەست بە جەنگ کردن، بانگیان بکەن بۆ ئیسلام و ئاینی خوایان بۆ ڕوون بکەنەوە و، جوان تێیان بگەیەنن، لەو بارەشەوە فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆرن، بۆ وێنە: ((كانَ النبيُّ إِذَا أَمَّرَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْ سَرِيَّةٍ، أَوْصَاهُ فِي خَاصَّتِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ، وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا ، ثُمَّ قَالَ : اغْزُوا بِاسْمِ اللَّهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ اغْزُوا ، وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تَمْثُلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا ، وَإِذَا لَقِيتَ عَدُوَّكَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ، فَادْعُهُمْ إِلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ أَوْ خِلَالٍ، فَأَيَّتُهُنَّ مَا أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى الْإِسْلَامِ ، فَإِنْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ، ثُمَّ ادْعُهُمْ إِلَى التَّحَوُّلِ مِنْ دَارِهِمْ إِلَى دَارِ الْمُهَاجِرِينَ، وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّهُمْ إِنْ فَعَلُوا ذَلِكَ ، فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ، فَإِنْ أَبَوْا أَنْ يَتَحَوَّلُوا مِنْهَا، فَأَخْبِرْهُمْ، أَنَّهُمْ يَكُونُونَ كَأَعْرَابِ الْمُسْلِمِينَ، يَجْرِي عَلَيْهِمْ حُكْمُ اللَّهِ الَّذِي يَجْرِي عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَلَا يَكُونُ لَهُمْ فِي الْغَنِيمَةِ وَالْفَيْءِ شَيْءٌ إِلَّا أَنْ يُجَاهِدُوا مَعَ الْمُسْلِمِينَ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا، فَسَلْهُمُ الْجِزْيَةَ، فَإِنْ هُمْ أَجَابُوكَ، فَاقْبَلْ مِنْهُمْ وَكُفَّ عَنْهُمْ ، فَإِنْ هُمْ أَبَوْا ، فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَقَاتِلْهُمْ)) (أخرجه مسلم برقم: ١٧٣١، والترمذي برقم: ١٤٠٨، وغيرها).

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێک کەسێکی دەکردە فەرماندەی سوپایەک یان دەستەیەک، دەربارەی خۆی ئامۆژگاریی دەکرد بەپارێزکاریی و، دەربارەی مسوڵمانان کەلە گەڵی دان، ڕای

دەسپارد کە لە گەڵیان چاک بێ، پاشان دەیفەرموو: بەناوی خواوە و، لەڕێی خوادا بجەنگن، لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن، کە بڕوایان بەخوانیە، بجەنگن و دزیی لەغەنیمەت مەکەن و، پەیمان مەشکێنن و ـ جەستەی کوژراون ـ ئەتک مەکەن و، وەمنداڵ مەکوژن،[١]

هەرکاتێک بەرەنگاری دوژمنت بوویەوە، لە هاوبەش پەرستەکان، سێ شتانیان لێ داوا بکە، ئنجا هەر کامێکیانیان وەڵام دایەوە، لێیان وەربگرە و لێیان گەڕێ:

أ- بانگیان بکە بۆ ئیسلام جا ئەگەر بەدەنگتەوە هاتن، لێیان وەربگرە و وازیان لێ بێنە، ئنجا بانگیان بکە، کە لە ناوچەی خۆیانەوە بگوازنەوە بۆ ناوچەی کۆچکەرەکان و، پێیان ڕابگەیەنە، کە ئەگەر ئەوان ئەوە بکەن، ئەوە کۆچکەرەکان چ مافێکیان هەیە، دەیان بێ و، چ ئەرکێکیان لەسەرە لەسەریان دەبێ، بەڵام ئەگەر قایل نەبوون بگوازنەوە، پێیان ڕابگەیەنە کە وەک مسوڵمانە خێڵەکییەکان دەبن و، ئەوحوکمەیان بەسەردا جێ بەجێ دەبێ، کە بەسەر ئەو بڕوادارانەدا جێ بەجێ دەبێ و، پشکیان لەدەست کەوتی بەشەڕ گیراوو، بەبێ شەڕ گیراودا نابێ، مەگەر لەگەڵ مسوڵمانان دا بچنە جەنگ.

ب- ئنجا ئەگەر ڕازی نەبوون ـ مسوڵمان بن ـ داوای سەرانەیان لێ بکە، ئنجا ئەگەر بەدەنگتەوە هاتن، لێیان وەربگرە و وازیان لێ بێنە.

ج- بەڵام ئەگەر ملیان نەدا ـ سەرانەش بدەن ـ ئەوە ناوی خوایان لێ بێنە و، یارمەتیی لە خوا بخوازە و لە دژیان بجەنگە...

---

(١) لەفەرموودەی دیکەدا باسی ئافرەت و پیاوی پیریش کراوە، کە نابێ بکوژرێن.

**دوو ئاگاداریی گرنگ:**

**یەکەم:** زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە دروست نیە سوپای ئیسلام لەگەڵ کۆمەڵێك دا بجەنگێ، کە بانگەوازی ئیسلامیان پێ نەگەیشتوە، دەڵێن: ڕەفتاری وا حەڕامە و، هەر کاتێکیش سوپایەکی ئیسلام کاری وای کرد و کوشتاری لێ کردن، پێویستە خوێن (دیة)ی کوژراوەکانی بدات:[1]

**دووەم:** سەرانە وەك هەندێك لەزانایان دەڵێن: بەس لەخاوەن کتێبەکان (أهل الكتاب) و مەجووسییەکان وەرناگیرێ، بەڵکو لەسەرجەم ئەو کافر و موشریکانە وەردەگیرێ، کە لەسەر بیرو بڕوای خۆیان دەمێننەوە و، ئامادەن کە لەژێر سایەی دەوڵتی ئیسلامیی دا بژین، ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانی ڕۆچوو (راسخ)یە، بەڵگەی ئەم ڕایەش زۆرن، بۆ وێنە:

**یەك:** (بخاري و ترمذي)گێڕاویانەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)سەرانەی لە مەجووسییەکانی (هَجَرْ)وەرگرتوە.

**دوو:** (ترمذي) گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەجووسییەکانی (بەحرەین)ی وەرگرتوە و، (عومەر)خوای لێ ڕازی بێ لەفارسەکان و، (عوسمان) خوای لێ ڕازی بێ لە فارس و بەربەرییەکانی وەرگرتوە.

**سێ:** ئەو فەرموودەیەش کە شەرحمان کرد، بەڕاشکاویی فەرموویەتی: ((إذا لقيت عدوك من المشركين)).

---

(١) بڕوانە: (فقه السنة، ج٣ ص:١٤٧)، السيد سابق.

**چوار:** (إبن القيم)یش گوتوویەتی[(١)]: (چونکە مەجووسییەکان خاوەنی شیرکن و کتێبیان نیە، سەرانە لێ وەرگیرانیان، بەڵگەیە بۆ وەرگیرانی لە هەموو موشریکەکان، بۆیەش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەبت پەرستەکانی عەرەبی وەرنەگرتوە، چونکە هەموویان بەر لەهاتنەخوارەوەی ئایەتی سەرانە (آية الجزية)[(٢)] کە لەپاش جەنگی تەبووک هاتۆتە خوارێ، مسوڵمان بوون).

## (٨) دووعا و پاڕانەوە لەگەرمەی جەنگ دا:

یەکێکی دیکە لەڕەوشتە بەرزە ئیسلامییەکانی مسوڵمانی موجاهید، ئەوەیە کە لەجەنگەی شەڕو گەرمەی هێرش و تێک ڕژاندا، لەخوا دەپاڕێتەوە و دوعا دەکات، چونکە لەو کاتەدا دوعا لەهەموو کاتێك چاکتر قبووڵ دەبێ و، یارمەتیی خواش لەهەموو کاتێك نیزیکترە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەو بارەوە فەرموویەتی: ((ثِنْتانِ لاتُرَدَّانِ: الدُّعاءُ عِنْدَ النِّداءِ وَعِنْدَ البَأسِ)) (أخرجه ابوداود برقم: ٢٥٤٢).

واتە: دوو جۆرە ـ دوعا ـ ڕەت ناکرێنەوە: پاڕانەوە لەکاتی بانگ و لەکاتی جەنگدا.

ئەمەش چەند وێنەیەک لەو دوعایانەی کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەکاتی جەنگ دا فەرموونی:

---

(١) بڕوانە (زاد المعاد في هَدْي خير العباد) ج٢ ص:٨٠)إبن قيم الجوزية.

(٢) مەبەست لە ئایەتی سەرانە ئایەتی ژمارە (٢٩)ی سوڕەتی (التوبة)یە

أ- ((أَللَّهُمَّ! مُنْزِل الكتابِ، ومُجْرِيَ السَّحابِ وهازِمَ الأَحْزابِ، إهْزِمْهُمْ وَآنْصُرْنا عَلَيْهِمْ)) (أخرجه البخاري برقم: ٢٨٠٤، ومسلم برقم: ١٧٤٢، عن عبدالله بن أبي أوفى).. واتە: ئەی خوایە! کتێب نێرەر و، هەور ڕۆێنەر و، شکێنەری کۆمەڵ ـ ی کوفر ـ تێکیان بشکێنە و سەرمان بخە بەسەریان دا.

ب- ((أللّهمَّ! مَنْزِلَ الكِتابِ، سَرِيْع الحِسابِ، إهْزِمِ الأَحْزابَ، أَللَّهُمَّ! اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ)) (أخرجه البخاري برقم: ٦٠٢٩، ومسلم برقم: ٤٦٤١). واتە: ئەی خوایە! نێرەری کتێب و، لێپرسەرەوەی خێرا! حیزبەکان تێک بشکێنە، ئەی خوایە! تێکیان بشکێنە و بیان هەژێنە!

ج- ((أللَّهُمَّ! أنْتَ عَضُدِي، وأنْتَ نَصِيري، بِكَ أحُولُ، وَبِكَ أصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ)) (رواه أصحاب السنن).. واتە: ئەی خوایە! بەس تۆ هێز و بازوو و پشتیوانمی، بەتۆ دەجووڵێم و، بەتۆ هێرش دەکەم و، بەتۆ دەجەنگم!

**بەڵێ بەڕێزان!**

ئیسلام ئاوا فێرمان دەکات، کە لەگەرمەی جەنگ و جیهاد دا، داوا لەخوا بکەین: دوژمن و ناحەزانمان تێك بشکێنێ و، ئێمەیان بەسەردا سەربخات! چونکە مسوڵمان دەبێ بۆ خۆی چی لە توانادا هەیە و لەدەست دێ بیکات ـ بۆ هەر کاروبارێك ـ ئەو جار داوا لەخوا بکات و، لێی بپاڕێتەوە کە بەهانایەوە بێت و پشتیوانیی بکات، نەک بۆ خۆی هیچ نەکات و، خەیاڵییانە چاوەڕوانی خواش بێت، کە هەموو کاروبارێکی بۆ پێک بێنێ و، هەموو دوژمن و ناحەزێکی بۆ بفەوتێنێ و بیانڕەتێنێ!!

## (٩) بەناوی خوا و، بەهۆی خواوە و، لەڕێی پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم):

کۆتایی ڕەوشتە جیهادییەکانی مسوڵمانی موجاهید و پێشمەرگەی ئیسلام، بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) دێنین کە دەفەرموێ: ((عن أنس بن مالك رضي الله عنه أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: انْطَلِقُوا بِاسْمِ اللَّهِ ، وَبِاللَّهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّهِ، لا تَقْتُلُوا شَيْخًا فَانِيًا ، وَلا طِفْلا ، وَلا صَغِيرًا ، وَلا امْرَأَةً ، وَلا تَغُلُّوا ، وَضُمُّوا غَنَائِمَكُمْ ، وَأَصْلِحُوا وَأَحْسِنُوا ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)) (أخرجه أبو داود برقم: ٢٦١٦، وضعفه الألباني)..

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: بڕۆن ـ بەرەو جیهاد ـ بەناوی خوا، بەپشتیوانیی خوا و، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پیری کەنەفت و منداڵی گچکە و ئافرەت مەکوژن و، ناپاکیی لە غەنیمەت مەکەن، دەست کەوتەکان خڕ بکەنەوە سەر یەک، وە کاروبارتان چاک بکەن و، چاکەکاریی ـ لەگەڵ خەڵکدا ـ بکەنە پیشە، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن.

**لەم فەرموودە بەپێزەی پێغەمبەری بەڕێزدا (صلی الله علیه وسلم) ئەم شتانە وەردەگیرێن:**

١- وەك لەپێشەوەش باسمان کرد، دەبێ دەرچوون و بەڕێ کەوتن بەرەو مەیدانی جەنگ و جیهاد، بەس بۆ خوا و بەناوی خواوە بێت و، دوور بێت لەهەر مەبەست و ناوونیشانێکی دیکە.

٢- دەبێ موجاهیدان پشتیان بەخوا قایم بێت و، هەرچەندە درێغییان نەکردوە لە ئامادەکردنی هەموو وەسیلە و هۆکارەکان دا، بەڵام بەشان و شەوکەت و وەسیلە و توانا و دەستەڵاتی خۆیان نانازن و، سەرکەوتن بەس لەخوا چاوەڕێ دەکەن!

٣-لەهەموو هەڵس و کەوت و ڕەفتارێکی نێوخۆ و مەیدانی جەنگیشیاندا، پابەندیی و مل کەچیی موو بەموویان هەیە، بۆ ڕێ و شوێن و ڕێبازی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر لەڕێز و حورمەت لەیەکدی گرتن و، گوێ گرتن و بەقسەکردن (السمع والطاعة) و، پرس و ڕاوێژ بەیەکدی کردنەوە بگرە، تاکو خۆپاراستن لەهەر خەسڵەت و ئاکارێکی ناشەرعیی و ناپەسەند، کە پێچەوانەی ئیسلام و یاسا و ئەدەبە بەرز و جوانەکانیەتی، چ لەنێوخۆ و چ لەگەڵ خەڵکی دیکەدا.

٤- نەکوشتن و دەست پاراستن لە پیاوی پیر ـ مادام لەشەڕدا بەشدار نەبێ ـ و منداڵی گچکە و ئافرەت.

٥- دزیی نەکردن لە غەنیمەت، هەرچەندە زۆریش کەم بێت و، خڕکردنەوە سەریەك و سەرژمێرکردنی هەموو جۆرە دەست کەوتەکان و دەستکاریی نەکردنیان.

٦- کاروبار ڕێکخستن و چاکەکاریی کردنە پیشە، لەگەڵ خەڵکدا بەگشتی، چ کافر بن چ مسوڵمان.

بەڵێ لەگەرمەی جەنگ و جیهادیش دا، پێشمەرگەی ئیسلام پابەند کراوە بەکۆمەڵێک یاسا و دەستووری شەرعیی و ئەدەب و ڕەوشتی

بەرز و جوان، کە دەبێ لەگەڵ دوژمنانیشی دا، ڕەچاویان بکات و لێیان لانەدات، ئەگەر نا بەئەندازەی لادانی و سەرپێچیی کردنی، جیهادەکەی کرچ و کاڵ دەردەچێ و، بگرە جاری وایە لەسەریشی گوناهبار و قەرزدار دەبێ!




## ئەو خەسڵەت و ڕەوشتە بەدانەی
## کە خۆیان لێ دەپارێزێ

ئەو خەسڵەت و خوو و ڕەوشتە نزم و پیسانەی کە مسوڵمانی موجاهید خۆیان لێ دەپارێزێ زۆر زۆرن بەڵام لەبەر کەم دەرفەتی لێرەدا بەس هەندێکیان لێ بەنموونە دێنینە:

### ١ـ بێ شەرمیی بەرانبەر بە خوا

بێ شەرمیی بەرانبەر بە خوا، پیسترین خەسڵەتە، چونکە لەخوا ترسان سەری هەمووی زانیارییەکە وەك گوتراوە: ((رَأْسُ الحِكْمَةِ مَخافَةُ اللهِ)) (رواه البيهقي برقم: ٧٤٤، عن ابن مسعود). مادام وابێ بە پێچەوانەوە: لەخوا نەترسان و شەرم لەخوا نەکردن، ئەسڵ و بنچینەی هەموو جۆرە تاوان و سەرپێچییەکە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

((إِسْتَحْيُوا مِنَ اللهِ عَزَوَجَلَّ حَقَّ الحَيَاءِ..)) (رواه أحمد).. واتە: وەک لەخوای زاڵ و پایەبەرز دەوەشێتەوە، شەرمی لێ بکەن.....

## ٢ـ بەد گومانیی بەرانبەر بەخوا:

یەکی دیکە لەو خەسڵەتە نزم و پیسانەی، کە پێشمەرگەی ئیسلام لە خۆییان ناوەشێنێتەوە، بریتیە لە بەد گومانیی (سوء الظن) دەربارەی خوا.

هەڵبەتە ئەم خەسڵەتە نزمەش وەک ئەوەی پێشێ و وەك هەر خەسلێتێکی دیکەی نزم و خراپ، لە درۆزناوو زەلکاوی بڕواکزیی و دڵنەخۆشییەوە پەیدا دەبێ، بەد گومانیی دەربارەی خوا لەزۆر بواردا خۆی دەنوێنێ:

١- ترسان لەمردنێ جۆرێکە لە بەد گومانیی بەرانبەر بە خوا.

٢- ترسان لە دوژمن و چەک و تەقەمەنیی و هەڕەشە و گوڕەشەی لە بەد گومانیی سەبارەت بە خوا وە هەڵدەقولێ، دەنا مادام بڕوات وابێ[١] خوا پشتیوانە، دەبێ بشزانی کە دەسەڵاتی خوا لە هی دوژمن زیاترە!

٣- ترسان لە هەژاریی و بێ بژێویی جۆرێکە لە بەد گومانیی بەرانبەر بە خوا، چونکە خوا بەڵێنی داوە کە دەتژیەنێ:

﴿ ۞ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا ﴾ (هود:٦)

---

(١) مەبەست لەم قسەیەش ئەوەنیە، کە مسوڵمانی موجاهید بابایەکی هەڵەشە و بیرکورت و ناواقیعیی و خەیاڵیی بێ!

واتە: هەر زیندەوەرێک، کە لەزەوی دایە، ڕۆزیی لەسەر خوایە.

٤- ترسان لە سپڵەیی و پێ نەزانیی وناسوپاسیی خەڵکی، جۆرێکە لە بەد گومانیی دەربارەی خوا، چونکە تۆ کە ئیشت بۆ خوا کرد، خەڵک پێ بزانێ، یان نەزانێ، خوا ئاگادارە و تۆماری کردوە، مادام وابێ خەم و مەراقی بۆ چیە!!.

٥- ڕیابازیی جۆرێکە لە بەد گومانیی سەبارەت بەخوا، چونکە بابای ڕیاباز، بۆیە سەرەنجی خەڵکی بۆلای کردەوەکانی خۆی ڕادەکێشێ، چونکە هەست بە چاودێریی خوا ناکات و، پێی وانیە کە خوا پاداشتی دەداتەوە، هەڵبەت ئەمەش بەدترین گومانە بەرانبەر بە خوا.

## ٣- کات بە فیڕۆدان بەقسە و کردەوەی پووچ:

دەستمایەی دەستی هەر ئینسانێک، ئەو کۆمەڵە سەعات و ڕۆژ و مانگ و ساڵەیە، کە تەمەنی پێک دێنن، جا بێگومان خەرج کردنی ئەو دەستمایە و بەڕێ کردنی ئەو تەمەنە گرانمایە، بەقسە و کردەوەی بێ سوود و پڕ و پووچ، کە لە زاراوەی ئیسلام دا (لغو)ی بۆ دانراوە، خەسڵەت و ڕەوشتێکی زێدە نزم و پیسە و، ئینسان بەرەو کەندەڵان و هەڵدێری مایە پووچیی و، خاوەن هیچیی دەبات، بۆیە پێشمەرگەی ئیسلام هێندەی دڕندەیەک خۆی لەم خەسڵەت و ڕەوشتە بەدە دەپارێزێ و، هەوڵ دەدات بەهیچ جۆرێک کەلێن و بۆشاییەك نەکەوێتە تەمەنیەوە، هەڵبەتە ئیسلامیش بەرنامە و پەیڕەوێکی بۆ

مرۆڤی مسوڵمان داناوە، کە هەرگیز بێ کار و دەست بەتاڵ نەبێ، بۆ وێنە، هەرکام لە:

١- نوێژ کردن.

٢- قورئان خوێندن و لەبەرکردن.

٣- موتالا.

٤- بیرکردنەوە.

٥- زیکر کردن.

٦- یادی مردن کردن.

٧- سەرکۆنەی خۆ کۆدن (محاسبة النفس).

٨- تۆبە کردن.

٩- سەردانی دۆستان.

١٠- گەڕان و سەرنج دان لە موڵکی خوا.

١١- قسەی خۆش لەگەڵ ماڵ و منداڵ و ئامۆژگاریی کردنیان و پەروەردە کردنیان.

١٢- پەیدا کردنی بژێوی حەڵاڵ.

١٣- نەخشە کێشان بۆ لەنێوبردنی دوژمنان.

١٤- غەزا کردن و سەنگەرگرتن.

١٥- ئێشک گرتن.

١٦- بەشداریی کردنی شین و شایی خەڵك.

١٧- سەردانە کۆمەڵایەتییە جۆراو جۆرەکان.

١٨- خەڵوەكێشان (إعتكاف) و.. هتد.

ئیسلام كردوونی بە ئەركی سەرشانی بابای مسوڵمان، بۆئەوەی هەرگیز بێ كار نەبێ و، مەودای نەبێ دەستە و ئەژنۆ دابنیشێ!!

## ٤- چڵێسیی و نەوسنیی:

یەكێ دیكە لەو خەسڵەت و ڕەوشتە دزێوو ناقۆڵایانەی، كە پێشمەرگەی ئیسلام لە خۆیان ناوەشێنێتەوە و، خۆییان لێ دەپارێزێ، بریتیە لە چڵێسیی و بەدوای داخوازییەكانی نەفس دا گەڕان و سووڕان، بەجۆرێك كە لە ڕێز و حورمەتی دادەلەنگێنێ و، لەنێو خەڵكی دا سووكی بكات و بیشكێنێ، ئنجا بێگومان چڵێسی لە بابای مسوڵمان ناوەشێتەوە، چونكە مسوڵمان بەندەی خوایە و، كۆیلەی گەدە و گیپاڵی نیە و، بۆیە دەخوات، تاكو بژی، نەك بژی تاكو بخوات!!

هەڵبەتە جڵە و توند كردنی نەفسیش، بنەڕەتیترین هۆی بە مراد گەیشتن و سەرفرازییە و، بەپێچەوانەوە: جڵە و شل كردنی نەفس بنك و ڕیشەی هەموو بەدبەختیی و ماڵ وێرانییەكە، خوای بێ وێنە لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾﴾ (النازعات: ٤٠-٤١).

واتە: بەڵام ئەوەی لە پلەوپایەی پەروەردگار بترسێ و نەفسی لە ئارەزووەكان بگێڕێتەوە، ئەوە بەهەشت جێگەیەتی.

## ٥- ڕژدیی و چرووکیی:

ڕژدیی و دەست قووچاندن و چرووکیی، یەکێکە لە خەسڵەتە هەرە بەد و ناقۆڵایەکان، بابای چرووک بەدگومانە سەبارەت بەخواو، پێی وایە عەمبارەکانی خوا بەتاڵ بوون و، هەر ئەوەندەیان تێدا مابووە کە هاتۆتە گیرفانی وییەوە! پێشمەرگەی ئیسلام زۆر خۆی لەم خەسڵەتە پیسە دەپارێزێ، چونکە دەزانێ کە خەسڵەتی گۆڕین، بە فەرمانی شەیتان لە مرۆڤ دا دێتەدی، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ ٱلشَّيۡطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلۡفَقۡرَ وَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾ (البقرة: ٢٦٨).

واتە: شەیتان بەڵێنی هەژارییتان دەداتێ و، فەرمانتان پێ دەکات بەڕژدیی.

هەڵبەتە بابای ڕژد و چرووکیش، سەرباری ئەوەی کە لە دنیادا سووك و بێ نرخ و بوغزێنراوە، لەلایەن خەڵکییەوە، لە دوا ڕۆژیشی دا، بێڕەزاترین سزا و ئازار چاوەڕێیەتی، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ١٨٠ ﴾ (آل عمران: ١٨٠).

واتە: بائەوانەی کە لەوەدا خوا لەبەخششی خۆی پێ داون، ڕژدیی دەنوێنن، وا نەزانن ئەو کارە شتێکی چاکە بۆ وان، بەڵکو بۆیان خراپەو،

لەمەو دوا، ئەوەی کە ڕژدییان تێدا دەکرد ـ دەکرێتە مارێکی[(١)] کەچەڵ و ـ لە ئەستۆیان دەئاڵێنرێ.

## ٦ـ گومانیی خراپ (سوء الظن) بەرانبەر بەخەڵك:

بەد گومانیی سەبارەت بە خەڵکی مسوڵمان، کێم و زووخاوێکە لە دڵێکی نەساغ و پیسەوە پەیدا دەبێ، چونکە ئینسان بەزۆری لە هەمبانەی خۆی دا گوێزان دەژمێرێ و، هەر کەسێک بەرانبەر بەخەڵکی، بەد گومانیی کردە یاسا و بنچینە، دیارە بۆخۆی پیس و نەگریس و بێ خێرە و (قیاس النفس)ی کردوە!

هەربۆیەش پێشمەرگەی ئیسلام، زۆر خۆی لەو سیفەتە پیسە دەپارێزێ و، لەخۆی ناوەشێنێتەوە، چونکە پێشمەرگەی ئیسلام لەبەر ئەوەی لە خۆی دا پاکیی و چاکیی کردۆتە پیشە و، پێشی خۆشە خەڵك بە پاك و چاکی تەماشا بکەن و، گومانیی چاکی پێ بەرن، دیارە بۆ خەڵکیش هەر بە هەمان ڕبە دەپێوێ!

خواش دەربارەی بەد گومانیی، فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞ﴾ (الحجرات:١٢).

---

(١) ئەمە لەفەرموودەی (صحيح)ی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)هاتوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی: [مَنْ آتاهُ الله مالاً فَلَمْ يُؤَدِّ زَكاتَهُ مُثِّلَ لَهُ شُجاعاً أَقرع...] رواه البخاري: ١٣٣٨، عن أبي هريرة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە زۆر گومانان دوورە پەرێزیی بکەن، بێگومان هەندێک گومان تاوانن.. وەک دەبینین لەبەر ئەوەی هەندێک گومان تاوانن و جێی خۆیان ناگرن، خوا فەرمانمان پێ دەکات، کە لە زۆربەی گومانان خۆمان بپارێزین، بەڵام جێی سەرنج ئەوەیە، کە خوا نەیفەرمووە: لەهەموو جۆرە گومانێک دوورەپەرێز بن، چونکە گومانی وا هەیە زۆر بەجێیە و، نەک هەر تاوان و خراپ نیە، بگرە خێر و چاکەشە و، نیشانەی عەقل و دووربینییە.

## ٧ـ بەدوای عەیبی خەڵکی دا گەڕان:

هەڵبەتە بەد گومانیی دەبێتە هۆی پەیدا بوونی گەلێك جۆرە نەخۆشیی و خەسڵەتی خراپ، کە یەکێکیان بریتیە لە (بەدوای عەیبی خەڵکی دا گەڕان)، ئەم خەسڵەتەش شتێکی بەد و ناڕەوایە، چونکە بەندە بێ عەیب نابێ و، مسوڵمانیش لە جیاتی سووڕان و گەڕان بەدوای دۆزینەوەی عەیب و ناتەواوییەکانی خەڵکی دا، پێویستە بەدوای هی خۆی دا بگەڕێ، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((طُوْبى لِمَنْ شَغَلَهُ عَيبُهُ عَنْ عَيْبِ الناسِ)) (أخرجه الديلمي برقم: ٣٩٢٩، والبيهقي في شعب الإيمان برقم: ١٠٥٦٣).. واتە: خۆشیی بۆ ئەو کەسەی کە هەڵە و ناتەواویی خۆی وای لێ دەکات، ئاگای لە هەڵە و ناتەواوییەکانی خەڵکی نەمێنێ.

دیسان یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی بابای مسوڵمان، بریتیە لە عەیب پۆشینی خەڵکی و، گەڕان و پشکنین بەدوای دیتنەوەی هەڵەو پەڵەی




خەڵکی دا، سیفەتی مسوڵمان نیە و، توندترین سزای بۆ دانراوە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيْهِ المُسْلِمِ، سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ القِيامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَة أخِيْهِ المُسْلِمِ، كَشَفَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفضَحُهُ بها في بَيْتِهِ)) (أخرجه ابن ماجه برقم: ٢٥٤٦، وصححه الألباني).. واتە: هەرکەسێک عەیبی برای مسوڵمانی بپۆشێ، خوا لە ڕۆژی دوایی دا عەیبی دەپۆشێ و، هەرکەسێك عەیبی برای مسوڵمانی وەدەربخات خوا عەیبی وەدەردەخات، و لەماڵی خۆی دا ڕیسوا و شەرمەزاری دەکات!!

## ٨. تەنگە پریسکەیی و زوو تووڕە بوون:

یەکی دیکە لەو ڕەوشت و خووە بەدانەی مسوڵمانی موجاهید، خۆیان لێ دەپارێزێ، بریتیە لە تەنگە پریسکەیی و بێ حەوسەڵەیی و زوو تووڕە بوون، چونکە وەك خواناسانی دڵ و بێدار فەرموویانە: (تووڕەیی ڕەشەبایەکە چرای عەقڵ دەکوژێنێتەوە) لەڕاستیی دا ئینسان بەهۆی عەقڵەوە، ڕاست و چەوت و چاك و خراپ لێك جیا دەکاتەوە و، هەر کاتێك حوکمی عەقڵ بەسەر مرۆڤ دا نەما، لە ئینسان دەشۆڕێ و، دەچێتە ڕیزی ئاژەڵ و ماڵات!

هەربۆیەش خوای هێمن و بە ئارام، لە وەسفی پارێزکار و چاکە کاران (المتقين والمحسنين)دا فەرموویەتی:

﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ

وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ ﴾ (آل عمران: ١٣٣ - ١٣٤).

واتە: ... ئەوانەی تووڕەیی قووت دەدەنەوە و، لە خەڵكی دەبوورن! پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((لَيْسَ الشَّدِيْدُ بالصُّرَعة، إنَّما الشَّدِيْدُ الّذي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ)) (أخرجه البخاري برقم: ٦١١٤، ومسلم برقم: ٢٦٠٩).. واتە: پاڵەوان ئەوە نیە كە خەڵكی زۆر لە عەرزێ دەدات، بەڵكو پاڵەوان ئەو كەسەیە، لە دەمی تووڕەیی دا، بەسەر خۆی دا زاڵ دەبێ.

## ٩- خۆ بەزلگرتن و خەڵک بە کەمگرتن:

ئەمەش یەكی دیكەیە لە خوو و خدە دزێوە ناشیرینەكان و، كە لەڕاستیی دا، گەورەیی و خۆ بەگەورەگرتن، بەس لایقی خوایە و جگە لەوی هەموومان بەندەین و، كەس ئیمتیاز و پلەی بەسەر كەسدا نیە و، لە بەندایەتی و سروشت و ڕەگەزدا، وەك دەنكەكانی شانە یەكسانین.

هەر خۆ بەگەورەگرتن و خەڵک بە كەمگرتن بوو، كە وای لە شەیتان كرد ببێتە شەیتان و، لەفەرمانبەریی خوا دەربچێ و، ماڵی خۆی كاول بكات، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾ (البقرة: ٣٤).

لەم ئایەتەدا خۆبە زلگرتنیشەیتان خراوەتەڕوو و، لەئایەتێكی دیكەدا، كە دەفەرموێ:

﴿ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾ (الأسراء:٦١).

خەڵک بە کەمگرتن و، بەچاوی سووک سەیرکرانی ئادەم لەلایەن شەیتانەوە، خراوەتەڕوو!.

بەڵام نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ، کە هەندێك شت هەیە دەچێتە خانەی عیززەت و دەمار بەرزییەوە و، بە خۆبەزلگریی (الكِبْر) لە قەڵەم نادرێ، چونکە ڕۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ((لا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ)) (أخرجه مسلم برقم: ١٤٧) هەر کەسێك هێندەی گرانیی گەردێك خۆ بەزلگریی لەدڵ دا بێ، ناچێتە بەهەشتێ، کابرایەك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! مرۆڤ حەز دەکات پێڵاوەکەی چاك بێ و، بەرگەکەی چاك بێ! ئەویش فەرمووی: ((إنَّ اللَه جَمْيلُ يُحِبُّ الجَمالَ، الِكْبرُ مَنْ بَطَرَ الحَقِّ وغَمَطَ النَّاسَ)) (أخرجه مسلم برقم: ١٤٧).. واتە: بێگومان خوا جوانە و جوانیی خۆش دەوێ، خۆبەزلگریی هەق نەسەلماندن و پێ شێل کردن و، خەڵك بەکەم سەیرکردنە.

### ١٠ـ زیادەڕۆیی کردن لە قسە و خەوو خۆراک دا:

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە دزێوانەی کە پێشمەرگەی ئیسلام، خۆیان لێ دەپارێزێ، بریتیە لە زیادەڕۆیی کردن و سنوور بەزاندن، لە قسەکردن و نووستن و خواردن و خواردنەوەدا، چونکە مسوڵمانی موجاهید بەپێچەوانەی بابای نامسوڵمانەوە، سووراوسوور دەزانێ کە جەستە، وڵاخی سواریی و خزمەتکاری ڕووحە و، پێویستە بەس بەئەندازەی پێویست و

بۆ بەڕێوەچوونی، داخوازیی و داواکاریی و پێداویستییەکانی جێبەجێ بکرێن و بێگومان تێپەڕاندن لە بەدەمەوە چوونی داخوازییەکانی لەش دا، بەزیانی عەقڵ و ڕووح تەواو دەبێ، هەربۆیەش خوا فەرموویەتی:

﴿ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾ (الأعراف ٣١).

واتە: بخۆن و بخۆنەوە و زیادەڕۆیی مەکەن، بێگومان خوا زیادەڕۆیانی خۆش ناوێن.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام لە کەلێن دا نەبێ و، بە ئەندازەی پێویست نەبێ، قسە ناکات، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مَنْ كانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ)) (أخرجه البخاري برقم: ٦٦٤٦، ومسلم برقم: ١٦٤٦، عن ابن عمر).

هەروەها بەئەندازەی پێویست نەبێ، نانوێ.. چونکە نووستن برای مردنێیە و، لە ڕادەی پێویست بەولاوە، دەبێتە هۆی سست و کول کردنی عەقڵ و، تەپلۆس کردن و خاوکردنی جەستە.

دیسان بە ئەندازەی پێویستیی و بەڕێوەچوون نەبێ، ناخوات و ناخواتەوە و، وەك پێشتر گوتمان: بۆیە دەخوات، تاکو بژی، نەك بەپێچەوانەوە، دیسان دەزانێ کە دەبێ مرۆڤ بەس هێندەی بخوات، کە خواردنەکەی هەڵیگرێ و پشتی ڕابگرێ، نەک هێندەی بخوات، کە ئەو خواردنەکەی هەڵبگرێ و هەموو گەدەی ڕابگرێ!!.

## ١١- زیادەڕۆیی کردن لە پێکەنین و گاڵتە و جەفەنگ دا:

مسوڵمانی موجاهید بابایەکی ئامانج دارە و، هەڵگری پەیامێکە و، ڕێبواری ڕێیەکی سەخت و دژوار و دوورو درێژە و، بەخۆ ڕەوا نابینێ، کە تەمەنی خۆی لە قسەی حەللەق و مەللەق و، بێ سەروپێو گاڵتە و جەفەنگ و، پێکەنینی بێ تام و خوێ دا، سەرف بکات، چونکە دەزانێ کە هەموو ئەوانە لەسەر حسابی بە ئامانج گەیشتنی و، پەیام ڕاگەیاندنی و، ڕێ بڕینی، تەواو دەبن، چەند بزمارێکی زلن لە چوارچێوەی تەمەنی دەدرێن و، درزی پێ دەبەن و لەنێوی دەبەن.

هەڵبەتە ناڵێین: پێشمەرگەی ئیسلام دەبێ ڕووگرژو مۆن و مرچ و، قسەناخۆش بێ و، قەت زەردەی نەیەتە سەر لێوان! نەخێر چونکە پێشەوامان (محمد) (صلى الله عليه وسلم) هەمیشە لەگەڵ خەڵکیدا ڕووخۆش و دەم بە زەردەخەنەبووە و، جاروبارە وەك ئاوڕشێن کردن، نوکتە و قسەی خۆشیشی کردوون، بەڵام...

**یەکەم:** نەیکردوە بە عادەت و پیشەیەکی بەردەوام.

**دووەم:** قەت لە هەقێ و لە سنووری ئەدەب و شەرع نەچۆتە دەرێ، وەك فەرموویەتی: ((إِنّي لَأَمْزَحُ وَلا أَقُولُ إلا الحق)) (أخرجه الطبراني في الأوسط برقم: ٨٧٠٦، وقال الهيثمي إسناده حسن).. واتە: بێگومان منیش گاڵتە دەکەم و قسەی خۆش دەکەم، بەڵام لەهەقێ بەولاوە نایڵێم.

هەڵبەتە زیادەڕۆیی کردن، لە پێکەنین و گاڵتە و جەفەنگ دا، وێڕای ئەوەی کە سزا و لێپرسینەوەی دواڕۆژی لەسەرە، لەدنیاش دا

مرۆڤ تێیدا تووشی زیان دەبێ، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی زۆر پێکەنین، فەرموویەتی: ((لاتكثروا الضحك فَأَنَّ كَثْرَةَ الضُّحْكِ تُميتُ القَلْبَ)) (أخرجه البخاري في الأدب المفرد برقم: ٢٥٣، وصححه الألباني).. واتە: بێگومان پێکەنینی زۆر دڵ دەمرێنێ.

هەروەها دەربارەی زیادەڕۆیی کردن لە گاڵتە و جەفەنگ دا، زانایان گوتوویانە: ((المِزاحُ يُذْهِبُ الهَيْبَةِ)).. گاڵتە و جەفەنگ ڕێز و سام ناهێڵێ.

## ١٢ـ جگەرە کێشان:

وەک لە پێشەوە گوتمان: پێشمەرگەی ئیسلام، ئامانج و مەبەستی لەجێ بەجێکردنی داخوازیی و پێویستییەکانی جەستەیدا، بەڕێوەچوونی و بەردەوام بوونی ژیانیەتی، واتە کە دەخوا و دەخواتەوە و دەنوێ و بەرگ دەپۆشێ و...هتد، بۆیە ئەم کارانە ئەنجام دەدات، تاکو بژی بەڕێوەبچێ و بتوانێ ئەرکی بەندایەتی بەجێ بێنێ، کەواتە: هەر شتێک لە خواردن و خواردنەوە و، پۆشاک و، خانوو و بەرە و، کەل و پەل یارمەتیی بەڕێوەچوونی ژیانی نەدات، بەزیادەی دەزانێ و، خۆی پێوە خەریک ناکات، بەتایبەتی ئەگەر ئەوشتە، زیانبەخش و خراپیش بێ و، نەک هەر یارمەتی بەڕێوەچوونی ژیانی و بەردەوام بوونی نەدات، بەڵکو زیانیشی لێ بدات و، پەکیشی بخات، وەک (جگەرە کێشان)ئەوە حەوجار خۆی لێ دەپارێزێ.

ئەوە هەمووی لەلایەکەوە، لەلایەکی دیکەشەوە: مسوڵمانی موجاهید وابیردەکاتەوە کە ڕێ و شوێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

دەبووژێنێتەوە، خراپە و بێ شەرعیی لادەبات و، دوژمنانی خوا و خەڵک لەنێو دەبات، کەواتە دەبێ یەکەم جار لە خۆیەوە پێدا بێ و، هیچ جۆرە بێ شەرعییەکی گەورە، یان گچکە لە خۆیدا نەهێڵێ و، لەپێش دا ڕێ و شوێنی پێغەمبەر لەخۆی دا زیندوو بکاتەوە و، بەسەر نێزیکترین و گەورەترین دوژمنیدا زاڵ بێ، کە نەفسی خۆیەتی، وەك گوتراوە: ((أعدى عدوِّك نفسك التي بين جَنبَيْك)) (روا البيهقي)... واتە: دوژمنی هەرە دوژمنت، ئەو نەفسەتە کە لە نێو دوو تەنیشتەکانت دایە.

ئنجا گومانیشی تێدا نیە کە جگەرە کێشان، وەک زانایانی وردبین و قووڵ ڕۆچوو ـ نەک درشت بین و سەرکێڵ ـ گوتوویانە: شتێکی حەرامە و، مرۆڤ پێی گوناح بار دەبێ، جا ئێمە لێرەدا دەرفەتی خستنەڕووی ئەو هەموو بەڵگانەمان نیە، کە حەرامیی جگەرە کێشانیان لێ دەفامرێتەوە، بەڵام لەبەر گرنگیی ئەم مەسەلەیە، بەخێرایی هەندێک لەو بەڵگانە دەخەینە بەرچاوی خوێنەر:

١ـ بێگومان جگەرە، وەك تێکڕای زاناو پسپۆڕو شارەزایان دەڵێن: پیس و زیان بەخشە و، هەموو شتێکی پیس و زیان بەخشیش، بەدەقی قورئان حەرامە وەک فەرموویەتی:

﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾ (الأعراف:١٥٧).

واتە: .. هەرچی چاک و بەسوودە، بۆیان حەڵاڵ دەکات و، هەرچی پیس و زیان بەخشە، لێیان حەڕام دەکات..

**٢**ـ هەر شتێک سوودی دنیا و دوارۆژی تێدا نەبێ و بەکاری بێنیێ، یان ئەگەر سوودیشی تێدا هەبێ، بەڵام زیاد لە ئەندازەی پێویست بەکاری بێنیێ، بەزیادەڕۆیی[1] (الإسراف ـ التذبیر)لەقەڵەم دەدرێ زیادەڕۆییش بە دەقی قورئان، پیشەی شەیتانە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿...وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ...﴿٢٧﴾﴾ (الأسراء: ٢٦-٢٧) .

واتە: زیادەڕۆیی مەکە، چونکە بێگومان زیادەڕۆیان، برای شەیتانەکانن..

ئنجا گومانیشی تێدانیە، کە جگەرە کێشان گەورەترین زیادەڕۆییە هەم لەلایەن ماڵ سەرەف کردنەوە، هەم لەلایەن خواردنەوە، هەم لەلایەن کات بەڕێ کردنەوە..

**٣**ـ خۆ کوشتن، بەدەقی قورئان حەڕامە، وەك فەرموویەتی:

﴿...وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ (النساء:٢٩).

واتە: خۆتان مەکوژن، بێگومان خوا لەگەڵتان بەبەزەییە.

---

(١) ڕاستتر وایە، کە وشەی (إسراف) بە زێدەڕۆیی و، (تَبذْیر) بە ماڵ بەفیڕۆدان، لێك بدرێنەوە، چونکە: (إسراف) زێدە ڕۆیی کردنە لە سامان خەرجکردن لە شتی حەڵاڵ و ڕەوادا، بەڵام (تَبذْیر) خەرجکردنی ماڵ و سامانە، لە شتی لە ئەسڵدا حەڕام و خراپ، وەك جگەرەکێشان.

دەجا گومانی تێدا نیە ،کە جگەرە کێشان خۆکوشتنێکی وردە وردە و پلە و پلەییە و، واقیعیش شایەدە، کە چەندان کەس بەو نەخۆشییانە مردوون، کە لە جگەرە کێشانەوە پەیدا دەبن.

٤ـ زیان بەخەڵک گەیاندن حەرامە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((لاضَرَرَ ولاضِرارَ)) (أخرجه ابن ماجة برقم: ٢٣٤٠).. واتە: زیان لەخۆدان و، زیان لەخەڵک دان دروست نیە.

ئنجا ئاشکرایە کە بابای جگەرە کێش، ئەندازەیەکی زۆری دووکەڵ و ژەهرەکەی، دەچێتە نێو سیپەلاک و هەناوی خەڵکییەوە و، تووشی نەخۆشیی دەبن، وێڕای ئەوەی کە دەشبێتە جێی لاساکردنەوە و چاولێکردنی هەندێک کەس و: ((الدالُّ على الشّرِّ كَفاعِلِهِ)).. واتە: هەرکەسێک ببێتە ڕێ پیشاندەر بەرە و خراپەیەک، وەک ئەوە وایە بۆخۆی ئەو خراپەیەی کردبێ.

٥ـ هەر شتێک زیان و قازانجی هەبن، مادام زیانەکەی پتربێ، بە دەقی قورئان حەرامە، وەک خوا فەرموویەتی:

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ﴾ (البقرة: ٢١٩).

واتە: دەربارەی ئارەق و قومار پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: خراپەیەکی گەورە و چەند بەرژەوەندییەکیان تێدان، بۆ خەڵکی، بەڵام گوناهەکەیان لە قازانجەکەیان گەورەترە.

هەڵبەتە دواتر خوای کاربەجێ، ئارەق و قوماری حەڕام کردن، وەك فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ﴾ (المائدة:٩٠).

ئەمانە هەندێک لەو بەڵگانە بوون، کە حەڕامیی جگەرە کێشانیان لێ دەفامرێتەوە.




## چۆنیەتیی هەڵس و کەوتی پێشمەرگەی ئیسلام لە ژیانی ڕۆژانەدا

خوای بێ هاوەڵ فەرموویەتی: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ (الأحزاب:٢١)..

واتە: بەڕاستیی لەپێغەمبەری خوادا، سەرمەشقییەکی چاکتان هەیە، بۆ هەر کامێکتان کە بەئومێدی خوا و، ڕۆژی دوایی بێ و، زۆر یادی خوا بکات.

بەڵێ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چاکترین و تەواوترین ڕابەرو پێشڕەو و سەرمەشقە، بۆ پێشمەرگەی ئیسلام، لە ورد و درشتی ژیانی داو، لە ڕاستیی دا، ئەرک و ئامانجی پێشمەرگەی ئیسلام بریتیە لە چاککردنەوە و بووژاندنەوەی، سوننەت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

**ئەمەش چەند نموونەیەك لە جۆر و چۆنیەتی هەڵسوكەوتی مسوڵمانی موجاهید:**

**١- خواردن و خواردنەوە:**

أ- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((سَمِّ اللهَ، وَكُلْ بِيَمْينِكَ، وَكُلْ مِمّا يَلِيْكَ)) (متفق عليه).

لەم فەرموودەیەدا، سێ ڕەوشتی بەرزی نان خواردن، خراونەڕوو:

أ ـ ناوی خوا هێنان لە سەرەتای دەست پێ کردنەوە.

ب ـ نان خواردن بەدەستی ڕاست.

ج ـ خوارن لەپێش خۆتەوە.. (واتە: دەست درێژنەکردن بۆ ئەملاولای قاپەکە) بێگومان ئەوە لە حاڵەتێک دایە کە یەکی دیکە، یان زیاترت لەگەڵدا بێ، ئنجا (أبو داود وترمذي) گێڕاویانەتەوە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (ئەگەر یەکێکتان لەبیری چوو لە سەرەتای نان خواردنەوە ((بسم الله)) بکات با هەر کاتێک وەبیری هاتەوە بڵێت: بەناوی خوا لە سەرەتا و کۆتاییەوە: ((بِسْمِ اللهِ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ)). هەروەها سوننەتە لە کۆتایی خواردنەکەی دا بڵێت: ((الحمد لله الذي أطعمني هذا ورزقنيه، من غير حول مني ولا قوة)) (أخرجه الترمذي برقم: ٣٤٥٨، وأبوداود برقم: ٤٠٢٣)، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی، کە ئەم خۆراکەی پێدام و کردویە بژیوم بەبێ جوڵە و هێزێك لە منەوە.[1]

---

(١) [بەبێ جوڵە و هێزێك لە منەوە] مانای وانیە ئەو بژیوە بەبێ هەوڵ و کۆشش

ب- دیسان سوننەتە کە خواردنی هاتە پێش، ئەگەر پێی خۆش بوو بیخوات، ئەگەر نا زەمی نەکات، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتوە، ئەگەر حەزی لێ کردبێ خواردوویەتی دەنا وازی لێ هێناوە: ((مَاعابَ رَسولُ اللهِ (صلی الله علیه وسلم) طعاماً قَطُّ)) (رواه البخاري برقم: ٥٤٠٩، ومسلم برقم: ١٨٧).

ج- هەروەها سوونەتە لە کاتی نان خواردن دا، پاڵ نەداتەوە، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی (لا آكُلُ مُتَّكِأً) (رواه البخاري)... واتە: بە پاڵدانەوەوە ناخۆم.

د- هەروەها سوننەتە بەسێ قامکان بخوات کاتێك تەواو بوو، قامکەکانی ئەو قاپە، کە تێیدا خواردوە، بلێسێتەوە و هیچیان پێوە نەهێڵێ[1]. (مسلم) وای لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گێڕاوەتەوە.

هـ- دەربارەی خواردنەوەشەوە، فەرموودە زۆرن، بۆ وێنە:

((بە یەک کەڕەتی ـ یەکبینە ـ مەخۆنەوە، وەک حوشترێ، بەڵکو دوو دوو، سێ سێ، بخۆنەوە و، لەسەرەتای خواردنەوەدوە ناوی خوا بێنن و، کەلێ بوونەوە ستایشی خوا بکەن)) (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

---

پەیدابووە! بەڵکو مەبەست ئەوەیە: کە مرۆڤ دەستی لە هێنانەدی و دروستکردنی دا نەبووە.

(١) لَعّق الأَصابِع والقَصْعة رواه:

## ٢ـ دانیشتن لەبەرو مەجلیس دا:

أ- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((با هیچ کەس پیاوێک لەجێی خۆی هەڵنەستێنێ و، پاشان لە جێی ویی دا دانیشێ، بەڵکو مەجلیسەکەتان فراوانتر بکەن و لێک وەدوور بکەون)) (بخاري و مسلم گێڕاویانەتەوە).

ب- (جابر بن سَمُرَة) (خوا لێی ڕازی بێت) گوتوویەتی: ((ئێمە کە دەچووینە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەرکامێکمان لەو شوێنە دادەنیشت کە دەیگەیشتێ)) (عن جابر بن سمرة قال كنا إذا أتينا النبي (صلى الله عليه وسلم) جلس أحدنا حيث ينتهي) (أخرجه أبو داود برقم: ٤٨٢٧، وصححه الألباني).

ج- هەروەها (أبو داود) گێڕاویەتەوە، کە ئینسان بۆی نیە لەنێوان دوو کەسان دا دانیشێ، مەگەر ئەوان ڕێی بدەن.

د- دیسان سوننەتە، کە مرۆڤ لە مەجلیسێ هەستا، بڵێ: (سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) (أخرجه أبو داود برقم: ٤٨٥٩، وصححه الألباني).. واتە: ئەی خوایە! بە پاکت دەگرم و سوپاست دەکەم، شایەدیی دەدەم، کە جگە لەتۆ هیچ پەرستراوێك نیە، داوای لێ بوردنت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە لات.

چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ئەو دوعایە دەبێتە مایەی سڕینەوەی ئەو شتانەی کە لەو مەجلیسەدا ڕوویان داوە (أبو داود وای گێڕاوەتەوە).

هـ- هەروەها وا باشە: هەرکاتێک مەجلیسەکەی بەجێ هێشت، دیسان سەلامێ بکات، چونکە سەلام کردنی یەکەمیان چاکتر نیە لەهی دووهەمیان، وەک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی، (أبوداود و ترمذي گێڕاویانەتەوە).

## ٣ـ نووستن و لە خەوهەستان:

أ- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە دەهاتە سەر جێی نووستنێ لەسەر لای ڕاستی ڕادەکشا، ئنجا دەیفەرموو: ((أللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إلَيْكَ ، وَوجَّهْتُ وَجْهي إلَيْكَ ، وفَوَّضْتُ أَمْرِي إلَيْكَ ، وَأَلجَأْتُ ظَهْري إلَيْكَ ، رَغْبَةً وَرهْبَةً إلَيْكَ ، لا مَلْجأ ولا مَنْجى مِنْكَ إلاَّ إلَيْكَ ، آمَنْتُ بِكتَابكَ الذي أَنْزلتَ ، وَبِنَبيِّكَ الذي أَرْسَلْتَ)) (أخرجه البخاري برقم: ٥٩٥٢).. واتە: ئەی خوایە! خۆم بەتۆ ئەسپارد و، ڕووی خۆم لەتۆ کرد و، کاروباری خۆم حەواڵەی تۆ کرد و، پشتم بەتۆ بەست، خۆشم دەوێی و لێت دەترسم، هیچ پەناو جێی ڕزگاریی نین، مەگەر بۆلای تۆ بێم، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کە ناردووتەتە خوارێ و، بە پێغەمبەرەکەت کە ڕەوانەت کردوە.

ب- هەروەها شتێکی چاک نیە، ئینسان لەسەر زگ بنوێ، وەک (أبو داود) بۆمان دەگێڕێتەوە.

ج- سوننەتە کە لە خەوێ هەستا، بڵێ: ((الحَمْدُ لله الذِي أحْيَانا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وإلَيْهِ النَشُور)) (رواه البخاري).. واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پاش ئەوەی مراندبووینی زیدووی کردینەوە و، گەڕانەوەش هەر بۆلای وییە.

## ٤- چاک و چۆنیی کردن:

(مسلم) گێڕاویەتەوە، کە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عادەتیان وابوو پێکەوە تۆقەیان دەکرد.

(الترمذي)یش گێڕاویەتەوە، کە پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پیاوێک لە ئێمە دەگاتە برایەکەی، یان هاوەڵەکەی، ئایا بۆی بچەمێتەوە؟! فەرمووی: نەء، گوتی: ئەدی بەخۆیەوە بگوشێ و، ماچی بکات؟! فەرمووی: نەء، گوتی: ئەدی دەستی بگرێ و تۆقەی لەگەڵ بکات؟ فەرمووی: بەڵێ.[1]

## ٥- قســـە کردن:

أ- مسوڵمانی موجاهید لە قسەکردنی دا تاڵووکەی ناکات و وشەکانی بە پەلەپەل ڕیز ناکات، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە قسەیەکی دەکرد، سێ جاران دووبارەی دەکردەوە، هەتا لێی حاڵی بن.

---

(١) دیارە یەکدی ماچ کردن بکرێتە قاعیدە باش نیە، بەڵام لەهەندێک حاڵەتی دەگمەن و تایبەت دا قەیناکات و، لەسوننەتیش دا هەندێک حاڵەتی لەوبابەتە گێڕراونەوە، بۆ وێنە: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نێوچەوانی هاوەڵانی و ئەوانیش دەستی ئەمیان ماچ کردوە. (عن أنس بن مالك قال: قال رسول الله يا رسول الله الرجل منا يلتقى أخاه أو صديقه أينحى له؟ قال: لا، قال أفيلتزمه ويقبله؟ قال: لا، أفيأخذ بيده ويصافحه؟ قال: نعم.) (راوه الترمذي برقم: ٢٧٢٨، وحسنه الألباني).

وەك (بخاري) هێناویەتی و، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قسەکانی ڕوون و دانە دانە بوون و، هەرکەسێك بیستبای، تێی دەگەیشت. وەك (أبوداود) گێڕاویەتەوە.

ب- هەروەها پێشمەرگەی ئیسلام، لەهەموو دیزان خۆی ناکاتە ئەسکۆی و لەجێی خۆی دا نەبێ قسان ناکات و خۆی لەئیشی کەسەوە هەڵناقورتێنێ، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ، تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ)) (أخرجه الترمذي برقم: ٢٣١٧، وصححه الألباني).

ج- ئنجا مسوڵمانی موجاهید هەروەک چۆن بە ئەدەبەوە گوێ لەقسەی خەڵکی ڕادەگرێ، هەرکاتێکیش قسەی کرد، هەوڵ دەدات بارودۆخێکی وا بڕەخسێنێ، گوێ لە قسەکانی بگیرێ، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای دەکرد، وەک بوخاري و مسلم بۆمان دەگێڕنەوە.

## ٦- سەرو سیما:

پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام، هەروەک چۆن هەموو ڕەفتارو ئاکارو هەڵس و کەوتێکی بەپێی سوننەت و ڕێ و شوێنی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، سەروسیما و دیمەنیشی، هەر بەپێی ئەو نەخشەیە بێ کەڕابەر و پێشەوای ڕەند و پەسەندی، بۆی کێشاوە.

ئنجا بێگومان سەروسیماو دیمەنی مرۆڤ، زۆر شت دەگرێتەوە و لق و پۆپی زۆرن، بەڵام ئێمە بەس چەند خاڵێکیان لێ باس دەکەین:

**(أ) پاک و خاوێنیی:** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((الطُّهُوْرُ شَطْرُ الإيمان)) (أخرجه مسلم برقم: ٢٢٣، عن أبي مالك الأشعري).. واتە: پاکیی نیوەی بڕوایە.

بەڵێ دیارترین و سەرەکیترین شت کە پێشمەرگەی ئیسلامی پێ دەناسرێ و، پێی لەغەیری خۆی جوێ دەکرێتەوە، بریتیە لە پاک و خاوێنیی، پاک و خاوێنیی دڵ و دەروون، زمان، لەش، جل و بەرگ.. هتد.

**(ب) ڕووگەشیی و زمان شیرینی:** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((هیچ شتێک لە چاکە بەکەم مەگرە، ئەگەر بەس ئەوەندەش بێ، کە بەڕووی خۆشەوە بگەیە برایەکەت)) (موسلیم گێڕاویەتەوە). دیسان فەرموویەتی: ((قسەیەکی چاک و خۆش خێرو چاکەیە)) (أخرجه البخاري برقم: ٢٨٢٧).

**(ج) سمێڵ کورت کردنەوە و ڕیش هێشتنەوە:** پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((أَحْفوا الشَّوارِبَ وَأَعْفُو اللِّحى)) (أخرجه البخاري برقم: ٥٥٥٤، ومسلم برقم: ٢٥٩، واللفظ لمسلم).. واتە سمێڵان کورت بکەنەوە و ڕیش بهێڵنەوە، بەڵام زۆربەی مسوڵمانانی ئەمڕۆ، ڕاست بە بەراژووی فەرمانی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم): سمێڵان بەردەدەنەوە و درێژیان دەکەن، هەتا دەچنە نێو زاریان و، ڕدێنیان لووس دەتاشن!! تەنانەت هی وایان هەیە وێڕای ڕیش، سمێڵانیش دەتاشێ!!

بەڵام پێویستە بزانرێ: کە ڕێکوپێک کردنی ڕیش، بەجۆرێک کە لەگەڵ سیما و کەسایەتیی ئینساندا بگونجێ، هەروەها پاک

ڕاگرتنی و شانەکردن و بۆن خۆش کردنیشی، هەر سوننەتە و پێچەوانەی ((وَأَعْفوا اللِّحي)) نیە، بەڵێ ئەسڵی ڕیش هەبوونە و، نەتاشینی سوننەتە، چونکە وشەی ((أَعْفو)) بەس هێشتنەوەی ڕدێن و نەتاشینی دەگەیەنێ و لێ کەم کردنەوەی ـ بەباری درێژیی و پانیی دا ـ و ڕێک و پێک کردنی، ناکۆک نیە لەگەڵ (بیهێڵنەوە) ((أَعْفو)) دا، بەپێچەوانەی تێگەیشتنی هەندێک کەس، کە زیاتر سەرنجی ڕواڵەت (ظاهر)ی دەقەکان دەدەن و، سەرەنجام لە جێ بەجێ کردنیاندا، تووشی هەڵەی سەیر دەبن و، لەڕاستیی دا هەندێک کەس (ڕدێن)ەکەیان لەگەڵ سیما و قیافەیان دا زۆر نەگونجاوە و، پێشیان وایە ئەگەر یەك سانتیمی لێ بقرتێنن، لە سوننەت لایان داوە! هەروەها سمێڵ کورت کردنەوەش، نابێ وابێ کە بەقوربانیی تاشینی بکات، وەک هەندێک کەس لەوەش دا زیادە ڕۆیی دەکەن.

## کورتە باسێک دەربارەی چۆنیەتی
## ڕیش هێشتنەوە و سمێڵ کورت کردنەوە

**خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم!**

هەرچەندە ئەوەی نووسراوە دەربارەی (ڕیش و سمێڵ) ـ بەڕای بەندە ـ لەقەدەر قەبارەی بەرهەمێکی ئاوا، کافی بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێک کەس داوایانکرد، کە چەند ئیشارەیەکیش بە بیروڕا و هەڵوێستی زانایانمان بکەم، بۆ زیاتر دڵنیایی، ئەم کورتە باسەم زیاد کرد:

**سەرەتا دەڵێم:**

ڕیش هێشتنەوە و سمێڵ کورت کردنەوە، سوننەت ـ وەک بۆ ڕیش زۆربەی زانایان و بۆ سمێڵ، هەموویان گوتوویانە ـ یان نا، لەچاو خەسڵەت و ڕەوشتە گرنگەکانی تر شتی گچکەن و، هێندە ناهێنن هەراو کێشە و مشت و مڕیان لەسەر بکرێ و، زانا و پێشەوایانی پێشینیشمان، لەکتێب و سەرچاوەکانیان دا، ئەمیەتی زۆریان پێ نەداون و، قسەی زۆریان دەربارەی نەکردوون، لەچاو مەسەلە و بابەتەکانی دیکە، کەواتە: بائێمەش هەر هێندە خۆمان بەو جۆرە مەسەلانەوە خەریک بکەین، کە شایستەیانە، ئەگەرنا حەتمەن لەسەر

حیسابی شتی لەخۆیان گەورەتر و گرنگتر دەبێ! دیارە مەبەستیشم ئەوە نیە کە هیچ شتێکی ئیسلام ـ خوانەکردە ـ بەکەم بایەخ سەیر بکەم، بەڵام زۆریشم لەسەر دڵ قورسە، کە دەبینم مسوڵمانان کەم و کووڕیی و کەلێنی زل زل لەئیمان و عەقیدە و، عیبادەت و، ڕەوشت و ڕەفتار و هەڵسوکەوتیان دا، هەن، کە بەشیرک و نیفاق و گوناهی گەورە دادەنرێن، کەچی لەو هەموو کەم و کووڕیی و کەلێنانە، بێ خەبەرن و، سەرگەرمی هەندێک جۆرە مەسەلان دەبن، کە لەقورئان و سوننەتدا ڕووبەرێکی گچکەیان داگرتوە و، زانا و پێشەوایانی حەکیم و لێزانیشمان، ئەمیەتێکی وایان پێ نەداون و، بە تەرازووی شەرعی خوا کێشاویانن و، چەندە بووبن، هێندە گرنگیی پێ داون و، خەمیان پێوە هەڵگرتوون، نەک زیاتر!!

ئێشتاش با سەرنجی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بدەین، بزانین داخۆ زانایانی پێشینمان چۆنیان تێگەیشتوون و، سەرەنجام مەسەلەی ڕیش و سمێڵان ـ کە لەلای هەندێك کراونە بنچینەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی (المولاة والمعاداة) ـ چۆنەو، لەسەر چ بنەمایەک ئێمە ئەو ڕایەی سەرێمان پەسەند کردوە؟!

**(١)** عن الزبير عن عائشة (رضي الله عنها) قالت: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم). ((عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ: قَصُّ الشَّارِبِ، وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ، وَالسِّوَاكُ، وَاسْتِنْشَاقُ الْمَاءِ، وَقَصُّ الْأَظْفَارِ، وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ، وَنَتْفُ الْإِبِطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ ـ قَالَ زَكَرِيَّا: قَالَ مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلَّا أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ)) (أخرجه أحمد برقم: ٢٥١٠٤، ومسلم برقم: ٢٦١، عن عائشة (رضي الله عنها)).

واتە: ((عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: دە (١٠) خەسڵەت لەسروشت (فطرة)ی ـ مسوڵمانەتی ـ ن: سمێڵ قرتاندن و ڕیش هێشتنەوە و، سیواك كردن و، ئاو لە لووت وەردان و، نینۆك كردن و، گرێچوو[1] شۆردن و، مووی بن هەنگڵ ڕنینەوە و، بەرتاشین و، تارەت بەئاوگرتن و (موصعەب) دەڵێ: دەیەمیشم لەبیرچووە، مەگەر: ئاو لەزار وەردان بێت)).

(شوكاني)یش لە لێكدانەوەی ئەم فەرموودیەدا دەڵێ: (إِعْفاءُ اللِّحْيَةِ تَوْفيرُها، كما في القاموسِ وفي روايةِ للبخاري: ((وَفِّروا اللِّحيِ)) وفي رواية أخرى لمسلم: ((وَأَوفُوا اللِّحى)) وهو بمعناه، وكانَ مِنْ عادَةِ الفُرْسِ قَصُّ اللِّحْيَةِ وَقَصُّها وَتَحْريقُها، وَأَما الأَخْذُ مِنْ طُولِها وَعُرْضِها، فَحَسَنُ، وَتُكْرَهُ الشُّهْرَةُ في تَعْظِيْمها، كما تُكْرَهُ في قَصِّها وَجَزِّها، وَقد آخْتَلف السَّلَفُ في ذالِكَ، فَمِنهُم مَنْ لَمْ يَحُدَّ بِحَدٍّ بَلْ قال: لايَتْرُكُها إلى حَدِّ الشُّهْرَةِ وَيأْخُذُ مِنْها، وَكَرِهَ مالِكُ طَوَلَها جِدّاً، وَمِنْهُمْ مَن حَدَّ بِما زادَ على القَبْضَةِ فَيُزالُ، وَمِنْهُمْ مَنْ كَرِهَ الأَخْذَ مِنها، إلاّ في حَجٍ أَوْ عُمْرَةٍ)[2]

واتە: هێشتنەوەی ڕدێن ((إعفاء اللحية)) زۆر كردن و هێشتنەوەدیەتی، وەك لە (قاموس)دا هاتوە و، لە ڕیوایەتێكی دیكەی بوخاریی دا: ((وَفِّروا اللِّحى)) هاتوە، كە بەیەك مانان و، عادەتی فارسەكان وابوو، كە ڕیشیان دەتاشی بۆیە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

---

(١) (گرێچوو) بەدیوی لای پشتەدەستی جوومگەی پەنجەكانی دەست، دەگوترێ.

(٢) بڕوانە: (نیل الأوطار) (ج١ ص١٣٦) باب سنن الفطرة.

ئەوەی قەدەغە کردوە و، فەرمانی کردوە بە هێشتنەوەی، (قاضي عياض)یش گوتوویەتی: تاشین و هەڵپاچین و سووتاندنی ڕدێن، خراپە، بەڵام لێ کردنەوەی بەباری درێژیی و پانیی دا، شتێکی باشە، هەروەها ناپەسەندە کە ڕدێن وابێ، ئینسانی پێوە بناسرێ، چ لەبەر زۆر زل کردنی و، چ بەهۆی زۆر کورت کردنەوە و هەڵپاچینیەوەبێ، زانایانی پێشین لەوەدا ڕایان جیاجیایە:

أ- هەیانە هیچ سنوور و ئەندازەیەکی بۆ چۆنیەتی ڕێك و پێك کردنی، دیاریی نەکردوە، بەڵکو گوتوویەتی: لێی ناگەڕێ کە بگاتە سنورێک (لەبەر زلیی) پێی بناسرێ و، لێی کەم دەکاتەوە، (مالک)یش پێی ناپەسەندبووە، زۆر درێژبێت.

ب- هەشیانە سنووری بۆ دیاریی کردوە، بەوە کە هەرچی لە نێولەپی دەست کە بەچەناگە دەگیرێ، زیاد بوو، لابرێ.

ج- هەشیانە پێی پەسەند نەبووە لەڕیش کەم بکرێتەوە، مەگەر لەکاتی حەج و عومرەدا.

**(٢)** عن إبن عمر (رضي الله عنهما) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: ((خالِفوا المُشْرِكِيْنَ وَفِّروا اللِّحيِ وَأَحْفُوا الشَّوارِب)) (پێشتر تەخریج کرا): ((وَكانَ ابْنُ عُمَرَ إذا حَجَّ أَو اعْتَمَرَ، قَبَضَ على لِحْيَتِهِ، فَما فَضَلَ، أَخَذَهُ)).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێی ڕازی بێ لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: پێچەوانەی هاوبەش پەیداکەران ڕەفتار بکەن، ڕدێنان بهێڵنەوە و سمێڵان کەم

بکەنەوە، بوخاریی ئەمەشی زیاد کردوە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش ئەگەر حەج یان عومرەی کردبایە، ڕدێنی خۆی لەدەست دەگرت و، ئەوەی لەمستی زیاد بووایە، لای دەبرد.

(الحافظ ابن حجر العسقلاني) یش لە (فتح الباري)[1]دا، دەربارەی هەمان مەسەلەی، ڕیش هێشتنەوە و کورت کردنەوە و، ڕێکخستنی، گوتوویەتی: (وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا حَجَّ أَوْ اعْتَمَرَ، قَبَضَ عَلَى لِحْيَتِهِ فَمَا فَضَلَ أَخَذَه).

ئەوەی لە (إبن حجر)یشەوە هێناومانە، جیاوازییەکی وای نیە لەگەڵ ئەوەدا، کە لە (شوكاني) نەقڵمان کرد. بۆیە بەپێویستی نازانم تەرجەمەی بکەم، بەڵام ئەوەی شایانی باس بێت، هەر ئەوەیە، کە هەرکام لە (طبري) و (الحسن البصري) و (عطاء)یش، کە سێ کەڵە زانای پایە بەرزن، هەمان ڕای (قاضي عیاض)یان هەیە و، بەڵگەی دەستکاریی کردن و ڕێک و پێک کردنی (ڕدێن)یش، بەس کردەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر نیە، بەڵکو هەرکام لە (عومەر) و (ئەبووهوڕەیرە)ش خوا لەهەموویان ڕازی بێ، هەمان هەڵوێستیان هەبووە.

ئنجا لەکەسیش پەنهان نیە کە (إبن عمر)تا چ ڕادەیەك پابەندی مووبەمووی بەسوننەتەکانی پێغەمبەرەوە هەبووە، تەنانەت جاری وابووە زیادە ڕۆییشی تێدا کردوە و، شتی وای کردوە بەناوی سوننەتەوە، کە زانایان دەڵێن: سوننەت نیە! (أبو هريرە)ش کە زۆرترین ژمارەی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گێراونەوە، ماقووڵ

---

(١) فتح الباري، ج١ ص٣٤٦.

نیە دەستکاریی ڕدێنی بکات، تاکو شتێکی لەوبارەوە لە پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) نەدیبێ، یان نەبیستبێ! (عمر بن خطاب)یش هەر پێویست بەباس کردن ناکات، کە ناگونجێ و ماقووڵ نیە، شتێک بکات و دڵنیا نەبێ، کە سوننەتی پێغەمبەرە (صلی الله علیە وسلم) و ڕەزامەندیی ئەوی لەسەرە!

ئنجا ئەوە، کە دەربارەی دەستکاریی کردن و ڕێک وپێک کردنی ڕیش، هیچ فەرموودەیەك نیە و، کەمتریش هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ، لەوبارەوە شتیان لێ نەقڵ کراوە، بەڕای بەندە هۆیەکەی ئەوەیە: کە ئەوەی هەندێك کەس لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) کە باسی هێشتنەوەی ڕیش دەکەن، دەیفامێتەوە، کە نابێ بەهیچ جۆرێ دەستکاریی بکرێ و، دەبێ هەر وازی لێ بهێنرێ! ئەوان ئەو مەبەستە هەڵە و نەویستراوەیان، لێ نەفامیوەتەوە و، زانیویانە کە مەبەستی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) بەس هێشتنەوە و نەتاشین و هەڵنەپاچینی بووە ـ وەک عادەتی موشریک و مەجووسییەکان ـ وە دیارە پێغەمبەری خواشیان بینیوە، کە ڕدێنی موبارەکی ڕێك و پێك کردوە، بەبەڵگەی ڕەفتاری عومەر و عەبدوڵڵای کوڕی و ئەبوو هورەیرە ـ بۆیە بەپێویستیان نەزانیوە، مشتومڕ لەسەر مەسەلەیەکی وا ڕوون و ئاشکرا بکەن و، سەرەنجام شتێکی ئەوتۆیان لەوبارەوە لێ نەگێڕاوەتەوە.

ئنجا با یەك دوو فەرمووەدەش، دەربارەی سمێڵ کورت کردنەوە، بێنینەوە و، پاشان سەرنجی لێکدانەوەی زانایانیش بدەین، داخۆ چۆن لەو مەسەلەیەش حاڵی بوون:

١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضِيَ اللهُ عَنْهُ قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): ((جُزُّوا الشَّوَارِبَ، وَأَرْخُوا اللِّحَى، خَالِفُوا الْمَجُوسَ)) (أخرجه مسلم برقم: ٢٦٠).

واتە: سمێڵان کورت بکەنەوە و، ڕدێن بەردەنەوە، پێچەوانەی مەجووسییەکان بکەن.

٢- عن زيد ابن أرقم رضِيَ الله عنه قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم): ((مَنْ لَمْ يَأْخُذْ مِنْ شَارِبِهِ، فَلَيْسَ مِنَّا)) (أخرجه أحمد برقم: ١٩٢٨٣، والترمذي برقم: ٢٧٦١، والنسائي برقم: ١٣).

واتە: هەرکەسێک لەسمێڵی کورت نەکاتەوە، لەئێمە نیە.

ئنجا بابزانین زانا و پێشەوایانمان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، چۆن لەمەسەلەی سمێڵ کورت کردنەوە و هەڵپاچینی، حاڵیی بوون:

سەرەتا پێویستە بزانین: کە سمێڵ (شارب) بریتیە لەو مووانەی کە لە سەروو لێوی سەرەوەی زار دەڕوێن، بەڵام ئەو مووانەی هەر دووک تەنیشتی زار، کە (سَبَّالَيْن) یان پێ دەڵێن، ئەوە هەندێک لەڕیزی سمێڵ و، هەندێکیش لەڕیزی ڕیشیان داناون، وەک (إبن حجر) دەڵێ.[1]

زانایان دەربارەی چۆنیەتی کورت کردنەوەی سمێڵان، سێ ڕایان هەن:

(أ) کورت کردنەوە و هەڵپاچینیان، هەتا گۆشتی ژێریان دەردەکەوێ کە ئەمە پێی دەگوترێ (إحفاءْ) و، ئەمە ڕای (أبو حنيفة)یە.

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري ج١ ص:٣٤٦).

(ب) کورت کردنەوە و قرتاندنیان، بە شێوەیەکی ئاسایی، کە (قص وتقصیر)ی پێ دەڵێن و، ئەمەش ڕای (مالک و شافعي)یە.

(ج) سەرپشک بوون لە نێوان هەڵپاچین و کورت کردنەوەدا، کە ئەمەش ڕای (أحمد)ە، ڕەحمەتی خوا لەهەموویان بێت.

دیارە هەرکام لە (نووي) لە (المجموع)[1] دەکەی داو، (إبن حجر) لە (فتح الباري)[2] داو قرطبي لە (الجامع لإحكام القرآن)[3]دا، لەوبارەوە قسەیان کردوە و، هەرچی (نووي) و (قرطبي)ین، هەر دووک لایان پێ وەک یەکن، بەڵام (إبن عبد البر):

لە کۆتایی هەڵسەنگاندنی ڕایەکان دا، دەڵێ: (إنَّما في هذا البابِ أَصْلان: ((أَحْفُوا)) وهُوَ لَفْظٌ مُحْتَمَلُ التَّأْوِيلِ، والثّاني ((قَصُّ الشّارِبِ)) وهو مُفَسَّر.

والمُفَسَّر يَقْضي على المُحتَمَلِ، وهُوَ عَمَلُ أَهْلِ المَدْينَةِ، وهُوَ أَولى ماقيل في هذا الباب)[4] واتە: بێگومان لەم مەسەلەیەدا، دوو ئەسڵمان هەن، یەکیان ((أحفوا))ە، کە وشەیەکە مانایەك زیاتر هەڵدەگرێ، دووەم: ((قص الشارب))ە، کە ڕوونکەرەوەیە، ڕوونکەرەوەش حوکم بەسەر وشەیەکدا دەکات، کە واتایەک زیاتری هەڵبگرێ، دیارە کردەوەی خەڵکی

---

(١) بڕوانە (المجموع ج١ص: ٢٨٧،٢٨٨).

(٢) بڕوانە (فتح الباری ج١٠ص:٣٤٧).

(٣) بڕوانە (الجامع الآحكام القرآن ج٢ص: ١٠٤،١٠٥)

(٤) بڕوانە (سنن الفطرة ص:٨١).

مەدینەش، لەسەر ئەوە بووە، بۆیە ئەو ڕایە باشترین قسەیە کە لەو بارەوە گوتراوە... (واتە: کورتکردنەوەی سمێڵان بەشێوەیەکی عادەتیی).

شایانی باسیشە: کە ئیمام مالیک، کە پێشەوای خەڵکی مەدینە بووە، پرسیاری لێ کراوە، دەربارەی کەسێك کە سمێڵی زۆر هەڵدەپاچێ و، وەك تاشینی لێ دەکات، لە وەڵام دا گوتوویەتی: (يُوجَعُ ضَرْباً وهذِهِ بِدْعَةٌ وإنَّ الإحْفاءَ المذكور في الحَديْثِ: قَصُّ الشّارِبِ وَهُوَ طَرَفُ الشَّعْرِ، وكانَ عُمَرُ يَفْتُلُ شارِبَهُ إذا أَكْرَبَهُ أَمْرٌ، فَلَوكانَ مَمْلِصاً[١] ماوَجَدَ مايَفْتُلُ فيه)[٢]. واتە: پێویستە - بابای وا - بەلێدان ئێشی پێ بگەیەنرێ و، ئەمە بیدعەتە و، ئەو هەڵپاچینەی کە لەفەرموودەدا هاتوە، مەبەست: کورتکردنەوەی ئەو بەشە سمێڵەی سەرلێوە، کە لە لێو تێ دەپەڕێ، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) کاتێک گیروگرفتێک نارەحەتی دەکرد، سمێڵی خۆی بە پەنجەکانی دەگرت و بای دەدا، ئنجا ئەگەر سمێڵی لووس تراشرابان، هیچی وەبەر دەست نەدەهات، بای بدات!

**بەڵێ خوێنەرە بەڕێزەکان!**

ئەمانە ئەو بەڵگانەبوون، کە بەندە پشتم پێ بەستوون، بۆ پەسەندکردنی ئەو ڕایەی کە لێرەدا خستوومەتە ڕوو، لە کۆتایی ئەم کورتە باسەش دا دەڵێم: بەهیوای ئەوەی لە ئەنجامی چاک

---

(١) مَمْلِصاً : کەسێك کە مووی بە سەری، یان بە سمێڵیەوە نەبێ و لەبەر لووسیی، پەنجەی دەست لێی گیر نەبێ و بخلیسکێ.

(١) بڕوانە (سنن الفطرة:٧٩).

تێگەیشتنی ئایین و بەرنامەی خوادا، تۆفیقی ئەوەمان هەبێ کە هەر شتە، وەک خۆی تەماشای بکەین و، هەموو شتێک لەشوێنی شیاوی خۆی دا دابنێین و، هێندە ئەمیەت و گرنگیی، بەعەقڵ و دڵمان بدەین، کە شایستەیانە و، هەر هێندەش خەم لە ڕیش و سمێڵمان بخۆین، کە لێیان دەوەشێتەوە، لەسەر حیسابی عەقڵ و دڵ و عەقیدە و ئیمان و تێگەیشتن و عیبادەت و جیهادمان، بەڕیش و سمێڵ و قیافەو سیمامانەوە، سەرگەرم نەبین و، هێندەش عەقڵ گەورە و سینگ فراوان و لێزان بین، کە هەرکاتێک کاروجیهادی ئیسلامییمان، پەکی لەسەر ئەوە کەوت، کە ڕیشی بۆلابەرین و هەڵی پاچین، یان تەنانەت بیتاشین، بێ سێ و دوو و دڵ لە دڵ دان، لای بەرین و، پێمان وانەبێ کە مسوڵمانەتییەکەمان نوقصانیی هێناوە و، کەلێنی تێ بووە!

هەروەها هێندە دڵ گەورە و، ئاسۆی بیر وزەین فراوان بین، کە لەبواری هەڵس و کەوتمان، لەگەڵ کۆمەڵگا و دەوروبەردا، مسوڵمانی بێ ڕیش و سمێڵمان، پێ ئینسانی ئاسایی بێ و، پێمان وانەبێ کە بەنەبوونی ڕیش، یان سمێڵیش، ئیمان و مسوڵمانەتییەکەی، کەلێنێکی وای تێ بووە، کە بەکەڵکی سەلام و کەلام نەماوە[1]، چونکە بێگومان

---

(١) شایانی باسە: کە هەندێک زاناش هەن پێیان وایە مەسەلەی ڕیش هێشتنەوە زیاتر عادەت و نەریتێکی کۆمەڵگای عەرەبیی ئەوسابووە و، لەکاردانەوەی مەجووسیی و جولەکە و نەصرانیی موشریکەکانیش دا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کردوە، مەرجیش نیە من ئەو ڕایەم بە ڕەهایی بەدڵ بێ، بەڵام حەزم کرد، بزانرێ کە ئەو ڕایەش هەیە و، یەکێك لەو زانایانەش، کە ئەو ڕایەی هەیە، زانایەکی فەرمووودەناسیی هاوچەرخمانە، بەناوی: [د. عبدالله بن یوسف الجُدَیْع]، کە لەوبارەوە کتێبێکی سەربەخۆی نووسیوە، بە ناوی[اللحیة:

زۆر کەسی واهەیە، هەر لەنێو ڕیزەکانی خۆشمان دا، کە خەسڵەتی گەلێک گەورەتر لە ڕیش و سمێڵی ناتەواوە و، وەک ئینسانێکی عادەتیی و ئاساییش لەگەڵی دەجووڵێینەوە! ئنجا هەرچەندە ئیسلام گرنگیی بەدەروون و دەر (باطن و ظاهر) و، پەنهان و ڕواڵەت داوە، بەڵام بێگومان لە بەراورد (مقارنة) دا: ئیمان لەئیسلام گەورەتر و، کاکڵ لە توێکڵ چاکترە و[2]، نابێ هیچ کاتێک لە تەرازوویێک دا دابنرێن و وەك یەك سەیر بکرێن، چ جای بەپێچەوانەوەش: ڕواڵەت بەسەر ژووری داو توێکڵ بەسەر کاکڵ و نێوەڕۆک دا، هەڵبژێرری و، گرنگی زیاتری، پێ بدری و، خەمی باشتری لێ بخوری و، کاری چاکتری لەسەر بکرێ!! چونکە بێگومان دەرەوە و ڕواڵەتی هەرکەسێک، ڕەنگدانەوەی ژوورەوەیەتی، مەگەر لەحاڵەتی نیفاق و دوو ڕوویی دا، کە ئەویش حاڵەتێکی نەخۆشیی خراپە.

خوا بکات، ئێمەش ئەگەر نێوەڕۆك و پەنهانیشمان، لە ڕواڵەت و ئاشکرامان، چاکتر و جوانتر نەبێ، وەك یەك بن، نەك - خوا پەنامان بدات - (دوور کوژی نیزیک خەسار) و (ناوی زل و شاری وێران) و (بە ڕواڵەت ڕازاوەی نێوەڕۆك کەلاوە) بین!

---

دراسة حديثية فقهية] ط١ ١٤٢٥هـ- ٢٠٠٤م تێبینی: لە کۆتایی ئەم باسەشدا پوختەیەکی ڕایەکەی دێنین.

(٢) مەبەستمان لە (کاکڵ و نێوەڕۆک)ئیمان و تەقوا و، ئەو (فضائل)ەیە، کە لە ئیمان و تەقوا پەیدا دەبن و، مەبەستیشمان لە توێکڵ و ڕواڵەت، سەر و سیما و قیافەیە، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (إن الله لاينظر إلى صوركم ولا أموالكم، ولكن ينظر إلى قلوبكم و أعمالكم) (رواه مسلم).

## گوشراوو پوختەی لێکۆلینەوەیەکی ورد و قووڵی فەرموودەناسێکی هاوچەرخ، لە بارەی ڕیش هێشتنەوە و، سمێڵ کورتکردنەوەوە:

### خوێنەرانـی سەنگین!

لە سۆنگەی ئەوەوە، کە خاوەنی کتێبی (اللِّحية) لێکۆڵینەوەیەکی ـ بەبڕوای من ـ زۆر ورد و هاوسەنگی لەبارەی: هێشتنەوەی ڕیش و کورتکردنەوەی سمێڵ (إعفاء اللحية وقصّ الشّارب)ە وە کردوە، بەباشی دەزانم لەم چاپی چوارەمەدا، پوختە و گوشراوێکی لێ بخوازمەوە، بەڵام لەبەر درێژ نەبوونەوە، دەقە عەرەبییەکەی قسەکانی ناهێنم و، ڕاستەوخۆ تەرجەمەی کوردیی دەکەم:

نووسەر دوای ئەوەی، پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد، ڕایدەگەیەنێ کە:

تەنیا سێ دانە لەو دەقانەی، وەك فەرموودە (حديث) پاڵدەدرێنە لای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە، کە قسەی لێ دەکەین، لەڕووی سەنەدەوە، ڕاست (صحيح)ن، کە ئەمانەن:

١ـ (خَالِفُوا الْمُشْرِكِينَ، وفِّرُوااللِّحَى، وأَحْفُوا الشَّوَارِبَ) أخرجه البخاري: ٥٥٥٣، ومسلم: (١/٢٢٢)وغيرها، عن عبدالله بن عمر.

٢ـ {جُزُّوا (وفِي لفظٍ: أحفوا الشوارب) وأعفوا (وفِي لفظٍ: أَرْخُوا) اللِّحىَ، وخالِفوا المجوس} أخرجه أحمد: ٨٧٨٥، ومسلم: ٢٦٠، عن أبي هريرة.

٣ـ (قُصُّوا سِبَالَكُمْ، وَوَفِّرُوا عَثَانِينَكُمْ، وَخَالِفُوا أَهْلَ الْكِتَابِ) أخرجه أحمد (٥/٢٦٤ ـ ٢٦٥) والبهقي في (الشّعب):٦٤٠٥ والطبراني في (الكبير): (٨/٢٨٢)، وسندهُ حسنٌ.

مانای هەرسێک فەرموودەکەش لەیەک نزیکن:

واتە: سمێڵتان کورت بکەنەوە و ڕیشتان بهێڵنەوە یان: (زۆر بکەن) پێچەوانەی (خاوەن کتێبەکان، هاوبەشدانەرەکان، مەجووسەکان) بجووڵێنەوە و ڕەفتار بکەن.

بەڵێ نووسەر دوای ئەوە و لەکۆتایی کتێبەکەیدا، لەژێر ناوونیشانی: (خلاصة الدراسة الحديثية)دا، دە (١٠) خاڵان دێنێ، کە ئەمە گوشراوەکەیانە:

١) شتێکی ڕاست و چەسپاوە لەبارەی سیفەتی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)، کە ڕیشی هەبووە و، ڕیشەکەی: جوان و پڕ و چڕ و گەورە بووە و، نیزیک بووە پڕی سینگی بێ...

٢) ئەو سێ فەرموودەیەی فەرمان دەکەن بە هێشتنەوەی ڕدێن، هەرسێکیان فەرمانکردنیان بەبەردانەوەی ڕیش و، کورتکردنەوەی سمێڵ، بەستۆتەوە بە پێچەوانەکردن (مخالفة)ی نامسوڵمانانەوە.

٣) ئەوەی لەوبارەوە گێڕراوەتەوە، کە ڕیش هێشتنەوە لەسوننەتەکانی خوارسك (سنن الفطرة)ە، لەڕووی سەنەدەوە چەسپاونین.

٤) ئەو دەقانەی پاڵ دەدرێنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لەبارەی لێگرتنی ڕیش (الأَخْذُ من اللحية)ەوە، هیچیان چەسپاو نین.

٥) ئەو شوێنەوارانەی لە هاوەڵآنەوە لەبارەی ڕیشەوە، گێڕراونەوە، ژمارەیەکی زۆریان بەڕاشکاویی فەرمانیان کردوە بە ڕیش هێشتنەوە.

٦) لێگرتنی ڕیش و ڕێک و پێك کردنی و، جوانکردنی شێوەی، لە هاوەڵان و، شوێنکەوتووان و، مەزهەبە خاوەن پەیڕەوەکانەوە، گێڕراونەوە و، لە زانایانی پێشینیش نەزانراوە ڕێیان لەوە گرتبێ و، ئەوە ـ یانی: ڕێگرتن لە ڕێک و پێک کردنی ڕیش ـ شتێکی داهێنراو و ڕیزپەڕی ئەم ڕۆژگارەیە!

٧) زانایانی پێشین هەیانبووە لەڕووی ئەندازەوە، وەك: زیاد لە چەنگ (قَبْضة) و، هەیانبووە لەڕووی کاتەوە، وەك: حەج و عومرە و، هەیانبووە بەبێ ڕەچاوکردنی ئەندازە و کات ڕدێنی خۆیان ڕێک و پێک کردوە.

٨) شتێکی چەسپاوە کە ڕیش هێشتنەوە، پێش هاتنی ئیسلام نەریت و عادەت بووە و، ئیسلامیش هەڵی نەوەشاندۆتەوە، بەڵکو وەک نەریتێک هێشتوویەتەوە.

٩) سۆراغ و پشکنین (تفتیش)دەریخستوە، کە ڕیش تاشین ـ بەویستی ئازاد ـ لەهیچ کەس لە: هاوەڵان و شوێنکەوتووان (الصَّحابة والتابعین)، هەروەها هیچکەس لە مسوڵمانان لە کۆمەڵگای مسوڵمانی سەرەتا، نەزانراوە.

١٠) مەزهەبە پەیڕەویی لێکراوەکانی ئەهلی سوننەت، هیچ کات لەبواری ڕیش بەردانەوەدا، ڕای تاشین (حَلْق)ی، ڕیشیان نەبووە، بەڵکو بەگشتی دوو ڕایان هەبوون:

**یەکەم:** پێناخۆشبوون (کراهة)ی تاشینی و، بەپەسەند دانانی هێشتنەوەی، کە ئەوە یەکێ لەدوو ڕایەکانی: مالیکییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکانە.

**دووەم:** قەدەغەکردنی تاشینی و، بەپێویست (فرض)دانانی هێشتنەوەی، کەئەوەش مەزهەبی حەنەفییەکانەو، ڕایەکەی بەرامبەریشی، هی سێ مەزهەبەکانی دیکەیە.

پاشان نووسەر لەژێر ناوونیشانی: (خلاصة الدراسة الفقهية)دا، لە حەوت خاڵان دا، پوختەی ئەوەی پێیگەیشتوە، دەخاتە ڕوو، کە ئێمەش گوشراوەکەی دێنین:

**یەکەم:** ڕیش بەردانەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵگەی ڕەوایەتیی، بۆیە ڕیش هێشتنەوە، ئەگەر مەبەستی چاولێکردنی پێغەمبەری تێدابێ، بەشتێکی پەسەند و باشیش دادەنرێ.

**دووەم:** ئەو دەقانەی فەرمان دەکەن بەهێشتنەوەی ڕیش، لەوە تێناپەڕن کە سوننەت و پەسەند بوونی بگەیەنن، لەکاتی هەبوونی خوازیاری جیاکاریی لە نامسوڵمانان دا (عند وجود مُقتضي مخالفة غير المسلمين).

**سێیەم:** عورف و نەریت، لەبواری هەڵس و کەوتان دا کاریگەرە و، بەپێی سوننەت دەبێ ڕەچاوی نەریت و باو بکرێ، مەگەر ناشەرعیی بێ، کەواتە: مادام ڕیش هێشتنەوە، بەو هۆکارەی باسکرا، پەسند (مندوب)بێ، واز لێهێنانی شتی پەسەند، بەپێچەوانەی شەرع دانانرێ، بەتایبەت لە کاتێک عورف و باو بیخوازێ.

**چوارەم:** باڵادەستیی و دڵنیابوون لەخۆ و بێ ترسیی، چەند هۆکارێکی گرنگن بۆ ئاشکراکردنی خۆ جیاکردنەوەی مسوڵمانان لەنامسوڵمانان، لەشتی ڕواڵەتیی دا، چونکە جاری وایە حاڵ و باڵی مسوڵمانان لە هەندێک کات و شوێندا، خوازیاری ئەوە دەبێ کە لەڕووی شتی ڕواڵەتییەوە، تەبایی و سازان لەگەڵ نامسوڵمانان دا پێشان بدەن، ئنجا لەو حاڵەتەدا: ڕەوایی پێشاندانی جیاکاریی (مخالفة) بۆ نامسوڵمانان نامێنێ...

**پێنجەم:** لەکۆمەڵگایەکدا، کە ڕیش هێشتنەوەی دەبێتە نەریتی مسوڵمان و نامسوڵمان، بابای مسوڵمان بۆ جیاکاریی لە نامسوڵمانان، فەرمانی پێناکرێ ڕیش بتاشێ، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەوەش دا کە هاوبەشدانەران ڕیشیان هەبوو، ڕیشی هێشتۆتەوە.

**شەشەم:** بەڵگە هێنانەوە بەوەی: بەدەرە لە دەقە ڕاستەوخۆیەکان (النصوص المباشرة) بۆ چەسپاندنی فەرزبوونی هێشتنەوەی ڕیش، وەک:

**١ـ** دەرچوون لە زگماک (الخروج من الفطرة).

**٢ـ** خۆشوبهاندن بەژنان (التشبُّه بالنساء).

**٣ـ** گۆڕینی دروستکراوی خوا (تغيير خَلْق الله).

**٤ـ** ئەتك بوون (مُثلَة)، ئەوانە نابنە بەڵگە...

**حەوتەم:** ڕیش هێشتنەوە، هەروەها قژ هێشتنەوە، خوازیاری ئەوەن، کە خاوەنەکەیان ڕێزیان لێ بگرێ، بۆیە کەسێک ڕیشی هێشتەوە،

پێویستە ڕێك و پێکی بکات و، شانەی بکات و..هتد، بەڵام ڕیش هێشتنەوە و پشتگوێ خستنی، بە قرژ و قۆڵیی و، دیمەن دزێویی، ئەوە پێچەوانەی ڕێبازی پێغەمبەری خواو (صلی الله علیه وسلم) ئامانجەکانی شەریعەتە...

کۆتایی ئەم بابەتەش، بەقسەیەکی (إبن عبدالبرّ الأندلسي)دێنین:

(الشَّعر والحَلْقُ لا يُغْنيان يوم القيامة شيئاً، وإنما المجازاة على النّيات والأعمال، فَرُبَّ مَحْلوقٍ خَيْرٌ من ذي شَعْرٍ، ورُبَّ ذي شَعّرٍ رجُلاً صالحاً).

واتە: هەبوونی موو و تاشینی لە ڕۆژی قیامەت دا، هیچ سوودی نیە، بەڵکو پاداشت لەسەر نیاز و مەبەستەکان و کردەوەکانە، موو تاشراو (مووی سەر، یان هەردووکیان) هەیە، لە خاوەن موو باشترە و، خاوەن مووش هەیە پیاوێکی باشە.




## هەستان و دانیشتنی
## مسوڵمانی موجاهید لەنێو بنکەدا

دەتوانین لەچەند خاڵێک دا، شێوەی هەستان و دانیشتنی پێشمەرگەی ئیسلام لەنێو بنکەدا و، لەگەڵ بەرپرسان و هاوەڵانی دا، ڕوون بکەینەوە:

### ١ـ گوێ ڕایەڵیی و فەرمانبەریی (السمع والطاعة):

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام، بڕوا و قەناعەتی وایە کە لەسەری فەرزە گوێ بۆ فەرمانی بەرپرس بگرێ و، بەقسەی بکات و لەفەرمانی دەرنەچێ و، بڕوای وایە هەر کاتێك بێ گوێی و بێ فەرمانیی کرد، تاوانبارە و خوا و پێغەمبەری لەخۆی تووڕە کردوون، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((مَن أطَاعَنِي فقَدْ أطَاعَ اللَّهَ، ومَن عَصَانِي فقَدْ عَصَى اللَّهَ، ومَن يُطِعِ الأمِيرَ فقَدْ أطَاعَنِي، ومَن يَعْصِ الأمِيرَ فقَدْ عَصَانِي)) (أخرجه البخاري برقم: ٢٧٩٧، ومسلم برقم: ١٨٣٥).. واتە:

هەرکەسێك سەرپێچییم بکات، ئەوە بێگومان سەرپێچیی خوای کردوە و، هەرکەسێك فەرمانبەریی فەرماندەکەی بکات، فەرمانبەریی منی کردوە، هەرکەسیش سەرپێچیی فەرماندەکەی بکات، سەرپێچی منی کردوە.

بەڵام ئاشکرایە کە ئەو گوێ ڕایەڵیی و فەرمانبەرییە، دەبێ لە جوغزی شەرع دا بێ و، لەبێ شەرعیی دا، بەقسەی کەس ناکرێ، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((گوێ گرتن و، فەرمانبەریی لەسەر بابای مسوڵمان پێویستە، لەهەر شتێکدا، کە پێی خۆش بێ، یان پێی ناخۆش بێ، مەگەر فەرمانی پێ بکرێ بە تاوان و سەرپێچییەك، چونکە هەرکاتێک فەرمانی پێکرا بەسەرپێچییەك، ئەوە نەگوێ گرتن دروستە، نە بەقسەکردن)) (بوخاریی و موسلیم گێڕاویانەتەوە)

## ٢- گەورە گچکایەتیی:

هەرچەندە پێشمەرگەی ئیسلام دەزانێ: کە ئینسانەکان لەوەدا، کە هەموویان مرۆڤن و لەیەك باب و دایك وەپاش کەوتوون و، خاوەنی یەك جۆرە سروشتن و بەندەی خوایەکن، وەك دەنکەکانی شانە یەکسانن، و بەرزیی و نزمییان نیە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا لەچەند لایەنێکی دیکەوە و، بەچەند ئیعتبارێکی دیکە، بڕوای بەوەش هەیە کە لەنێوان مسوڵمانان دا، بەرزیی و نزمیی و، گەورە و گچکایەتیی هەیە، بۆ وێنە:

**(أ) لایـەنـی زانیاریی:**

خوا فەرموویەتی: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر:٩). واتە: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و، ئەوانەی نازانن یەکسانن؟!.

**(ب) لایەنی ژیریی:**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((لِيَلِيَني مِنْكُمْ أُولُوا الأَحْلامِ وَالنُّهى، ثُمَّ الذيْنَ يَلُونَهُمْ ، ثُمَّ الذِيْنَ يَلُونَهُمْ)) (أخرجه مسلم برقم: ٤٣٢، وابن حبان برقم: ٢١٧٢). واتە: با خاوەن هۆش و عەقڵەکانتان لێمەوە نزیك بن، ئنجا ئەوانەی لە دوایانەوە دێن، دوایی ئەوانەی لە دوایانەوە دێن.

**(ج) پـــارێزکاریی:**

خوای زانا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (الحجرات: ١٣).
واتە بێگومان بەڕێزترتان لەلای خوا، پارێزکارترتانە...

**(د) ڕەوشت بەرزیی:**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((بێگومان ئەوانەتان، کە ڕەوشتیان جوانترە، لەلام خۆشەویستترن و، لەڕۆژی دوایی دا، لە پلە و پایەو جێ و ڕێ دا، لێم نزیکترن)) (رواه الترمذي).

**(هـ) دەست پێشخەریەتیی (السابقية):**

خوای کار بەجێ و دادگەر فەرموویەتی: ﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ (١٠) أُولَٰئِكَ الْمُقَرَّبُونَ (١١)﴾ (الواقیعە: ١٠-١١).

واتە: دەست پێشخەران، دەست پێشخەران، یـــان: پێشکەوتووان، پێشکەوتووان ئەوانەن ـ لەخوا ـ نیزیکان.

دیسان خوا (عز وجل) فەرموویەتی: ﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا﴾ (الحديد: ١٠).

واتە: ئەوانەتان کە لەپێش گرتن ـ ی شاری مەککە ـ دا ماڵیان خەرج کردوە و جەنگیان کردوە، ـ لەڕێی خوادا ـ ئەوان پلەیان مەزنترە ـ لەوانەی دوایی ـ .

**(و) تەمـــەن زۆریی:**

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَم يَرْحَمْ صَغِيَرنا وَيعْرِفْ شَرَفَ كَبِيْرِنا)) (أخرجه الترمذي برقم: ١٩٢٠، وقال: حسن صحيح).. واتە: هەرکەسێك بەزەیی بەگچکەمان دا نەیەتەوە و، ڕێزی گەورەمان نەزانێ[١] لە ئێمە نیە.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام، هەرکەسێک یەکێک لەو ئیمتیازانەی تێدابن، ڕێز و حورمەتێکی تایبەتیی بۆ دادەنێ، لەبەر ئەوەی ئایین و بەرنامەکەی وای فەرمان پێ دەکات، بەڵام ئەو جۆرە کەسانە، نابێ خۆیان بەسەر خەڵکی دا هەڵکێشن و، هەوڵ بدەن بە تۆبزیی ڕێز و حورمەت لە خەڵکی بستێنن، بەڵکو دەبێ خەڵکەکە بۆخۆی ئەو هەستەی هەبێ.

---

(١) مەبەست لە (كبيرنا) یانی : بەتەمەنمان.

کەواتە لە بنکەی پێشمەرگەکانی ئیسلام دا، بابایەک کە زانیاریی، یان تەقوا، یان عەقڵێکی زیادەی پێوە شک دەبردرێ، بەبارتەقای ئەو زانیاریی و تەقوا و بیر و هۆشە زیادەیە، زیادە ڕێزێکی لێ دەنرێ، هەروەها لەبنکەیەک دا کە پێشمەرگەکانی بە پێشمەرگەی ئیسلام لەقەڵەم دەدرێن، بابایەک کە ڕابردوو و دەست پێشخەریی هەبووە، لە خزمەتی ئیسلام و جیهاد کردن دا، لە غەیری خۆی بە لەپێش تر تەماشای دەکرێ، دیسان کەسێک تەمەنی هەڵکشیوتربێ، بەئەندازەی هەڵکشیویی تەمەنەکەی، ڕێز و حورمەتی پتری بۆ دادەنرێ، هەروەها کەسێک پلە و ئیمتیازێکی تایبەتیی هەبێ، لەخوو وخدە و ڕەوشتی بەرزدا، ڕێزی تایبەتیشی هەیە، هەروەها..

## ٣ـ خۆنەبواردن و خۆتێک نەبەستن: [١]

مسوڵمانی موجاهید لە سۆنگەی ئەوەوە کە بۆ خوا ئیش دەکات و، ئامانج و مەبەستی وەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوایە، لە هیچ ئیش و کارێکی خێر وچاکەدا، کە لەبڕستی دابێ، دریغی ناکات و، خۆی نابوێری و، خۆی لەکەس نابەستێ، بەڵکو هەوڵ دەدات: هەرچی زیاتر، خێر و پاداشتی بۆ بنووسرێ، بەهۆی ڕاپەڕاندن و بەجێ هێنانی

---

(١) خۆ تێک بەستن، بەوە دەگوترێ: کە کۆمەڵێک ئیشێکیان بە ئەستۆوە بێ و، هەرکامێکیان چاوی لەوانی دیکەوە بێ و، چاوەڕوانیی بکات داخۆ کەنگێ دەیکەن! بەو جۆرە ئیشەکە بکەوێتەوە و نەکرێ، لەزاراوەی ژێربێژیی (منطق)یشدا ئەم شتە (دَوْر)ی پێ دەگوترێ.

ئەرك و كاروبارەوە و، لەڕاستیی دا پێشمەرگەی ئیسلام، خزمەتكردن و كاروبار ڕاپەڕاندن، بە مەیدانی پێش بڕكە (مسابقة)دادەنێ، چونكە خوا فەرموویەتی:

﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ (الحديد:٢١)

واتە: وە پێشبڕكە بكەن بەرەو لای لێبوردنێک لە پەروەردگارتانەوە و، بەرەو لای بەهەشتێك، كە پانتاییەكەی، هێندەی پانیی ئاسمان و زەوییە.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام خۆبوێر نیە، چونكە دەزانێ چەندە حەوجێی پاداشتێكە، كە بەهۆی خزمەتكردن و كاروبار ڕاپەڕاندنەوە، پێی دەبڕێ، هەروەها خۆی لەخەڵكی نابەستێ، بەڵكو دەست پێشخەریی دەكات و پێشبڕكە دەكات، كە لە پێش خەڵكی دا دەست بگەیەنێتە شتێک، كە كرێ و قیمەتی، لێبوردنی پەروەردگار و بەهەشتی بەرینە.

## ٤- گرنگیی دان بەپاک و خاوێنیی:

یەكێ دیكە لەو خووڕەوشتانەی كە پێشمەرگەی ئیسلام لەژیانی پێشمەرگایەتیی و لەنێو بنكەدا ڕەچاویان دەكات، بریتیە لەگرنگییدان بەپاک و خاوێنی، خوای زانا فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ﴾ (البقرة:٢٢٢).

واتە: بەڕاستیی خوا تۆبەكارانی خۆش دەوێن، خۆپاككەرەوانی خۆش دەوێن.

پێغەمبەریش (صلى الله علە وسلم) فەرموویەتی: ((الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيْمَانِ)) (أخرجە مسلم برقم: ٢٢٣).. واتە: پاك و خاوێنیی نیوەی بڕوایە.

هەڵبەتە ئەو پاك و خاوێنییەش، پێویستە لەهەموو شتێك دا ڕەچاو بکرێ.. واتە: مسوڵمانی موجاهید دەبێ لەهەموو شتێك دا پاک و خاوێن بێ:

**(أ) دڵ و دەروونـی:** ڕێ بەو خەسڵەتە پیسانە نەدات، کە وەک زبڵ و زاڵ، دەروونی پیس دەکەن، وەک: بەدگومانیی (سؤ الظن)، ئێرەیی (حسد)، ڕژدیی (بُخْل)، خۆبەزلگریی (كِبْر).. هتد.

**(ب) زمـــانی:** کەبیپارێزی لەوەی قسەیەکی پێ بکات، بنەتۆوی خۆی نەکاتەوە، یاخود سەرەڕای بنەتۆ و نەکردنەوە، لەسەریشی قەرزار بێتەوە، وەک: بوختان، غەیبەت، خۆهەڵدانەوە، توانج وپلار، بەخۆدا شکاندنەوە، ناووناتۆرە هەڵدان، سوێند خواردن بەغەیری خوا، سوێند بەخوا خواردنی بەدرۆ، قسەهێنان و بردن، جنێوو قسەی ناشیرین... هتد.

**(ج) زار:** کەبیپارێزێ لەشتی بۆن ناخۆش، وەک، توور، پیواز، سیر، چونکە پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم) فەرموویەتی: ((هەرکەسێک پیواز و توور و سیری خوارد، با نیزیکی مزگەوتەکەمان نەبێ...)) (موسلیم گێڕاویەتەوە).

هەڵبەتە بۆن و خڵتەی جگەرەش ئەگەر لەبۆنی توور و پیواز و سیر، ناخۆشتر نەبێ، کەمتر نیە، سەرەڕای ئەوەی حەڕامیشە، وەك پێشتر باسمان کرد.

ئنجا ئیسلام، کە سیواك کردنی بەسوننەتێکی گەورە داناوە، هەر بەمەبەستی پاک ڕاگرتنی زارە.[١]

**(د) جەســتە:** پاك ڕاگرتنی جەستەش، بەسێ شتان پێك دێ:

**یەک:** شۆردنی، هەربۆیەش پێشەوامان فەرموویەتی: ((مافی خوایە لەسەر هەموو مسوڵمانێک، کە هەموو حەوت ڕۆژێك خۆی بشوات، سەری و لەشی بشوات)) (بوخاریی و موسلیم گێڕاویانەتەوە).

**دوو:** پاك ڕاگرتنی جل و بەرگ: وەك ڕابەرمان فەرموویەتی: ((مَنِ اتَّخَذَ ثَوْباً فَلْيُنَظِّفْهُ))(رواه الطَّحاوي)... واتە: هەر کەسێك بەرگێکی لەبەر کرد، باپاکی بکاتەوە.

**سێ:** خۆبۆن خۆشکردن: هەربۆیەش پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((خۆشۆردن و، خۆ بۆنخۆش کردن و، سیواك کردن، لە ڕۆژی جومعەدا، لەسەر هەموو مسوڵمانێك پێویستە)) (أخرجه أحمد برقم: ٢٣١٢٦، وقال شعيب الأونؤوط: إسناده صحيح).

**(هـ) شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون:** لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە هاتووە: ((فَنَظِّفوا أَفْنِيتَكُمْ ولا تَشَبَّهوا باليَهودِ)) (أخرجه الترمذي برقم: ٢٧٩٩).. واتە: بەروپێش دەرگاتان خاوێن ڕاگرن و، لاسایی جوولەکەکان مەکەنەوە ـ لەپیس و پۆخڵیی دا ـ.

---

(١) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەربارەی سیواك فەرموویەتی: ((السِّواكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَم وَمْرضاةٌ لِلرَّب)). متفق عليه، واتە: سیواك پاك کەرەوەی زارە و ڕازی کەری پەروەردگارە.





**تێبینیی:** لەسەر مسوڵمانی موجاهید پێویستە، کە دەوروبەری شوێنی تێدا ژیانیشی، پاک ڕابگرێ، بۆوێنە: نابێ زبڵ و زاڵ لە نزیک بنکەکانەوە فڕێ بدات و، نابێ لەنزیک بنکەکان تارەت بگرێ!!!.[١]

## ٥ـ دوانەکەوتن لەکاتی دیاریکراوی نوێژ، دەرس خوێندن، نان خواردن، ئێشکەگرتن... هتد:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((إنَ اللهَ يُحِبُّ إذا عَمِلَ أحَدُكُمْ عَمَلاً، أَنْ يُتقِنهُ)) (أخرجه البيهقي في شعب الإيمان برقم: ٥٣١٢)... واتە: بێگومان خوا پێی خۆشە، ئەگەر یەکێکتان ئیشێکی کرد، بەڕێک و پێکیی بیکات.

هەڵبەتە سەرەکیترین مەرجی ڕێك و پێکیی و وردەکاریش، ئەوەیە کە: ئەو کارە لەکاتی دیاریکراوی خۆی دوانەکەوێ.

بەڵێ پێشمەرگەی ئیسلام، بەر لەوەی کاتی نوێژ بێت، خۆی ئامادە دەکات، تاکو فریا بکەوێ، لەکاتی خۆی دا بیکات، هەروەها دەرس خوێندن و، نان خواردن و، ئێشکەگرتنیش بەهەمان شێوە، چونکە دواکەوتن لە جێبەجێ کردنی هەر ئیشێکدا، بەهۆی نەتوانین و تەنبەڵیی و قالب گرانییەوەیەو، پێشمەرگەی ئیسلامیش هەموو دەمێ

---

(١) لێرەدا مەبەست حاڵەتێکە کە بنکەکان لەشاخ و چیا و دەشت و دەربن و ئاوەدستیان بۆ ساز نەکرابێ، وەك کاتی خۆی لە خەباتی شاخ دا، جاروبار، ئەو حاڵەتانە دەبوون، بەرلەوەی جێ و ڕێ ڕێك بخرێ.

وەك گورزی فیتووی[1] چالاك و گورج و گۆڵ و ئامادەیە و، دایم و دەرەم لەخوا دەپاڕێتەوە: ((اللّٰهُمَّ إنِّي أعُوذُبِكَ مِنَ الهَمِّ والحَزَنِ وَالعَجْزِ وَالكَسَلِ...)) (أخرجه البخاري برقم: ٢٧٣٦، ومسلم برقم: ٢٧٠٦).. واتە: ئەی خوایە پەنات دێنمە بەر، لەخەفەت و دڵتەنگیی و نەتوانین و تەنبەڵیی.

## ٦ـ ئێشکەگرتن (الحِراسة):

ئێشکە گرتن و پاسیی کردن، لەبەرنامەی خوادا، پاداشتێکی یەکجار بەرز و بەپێزی هەیە و، کارێکی زۆر گرنگ و بایەخدارە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((عَيناْنِ لاتَمَسُّهُما آلنَّارُ: عَينٌ بَكَتْ مِنْ خَشيَةِ الله، وَعَينٌ بَاتَتْ تَحْرِسُ في سَبيلِ آلله)) (أخرجه الترمذي برقم: ١٦٣٩)... واتە: دوو چاو ئاگریان تووش نابێ، چاوێك کە لەترسی خوا گریابێ و، چاوێك کە لەڕێی خوادا، ئێشکەی گرتبێ.

هەڵبەتە پێشمەرگەی ئیسلام، بەحوکمی فەرموودەی: ((كُلُكُمْ راعٍ وَكُلُكُمْ مَسئُولٌ عَنْ رَعْيَتِهِ..)) (أخرجه البخاري برقم: ٢٢٧٨، ومسلم برقم: ١٨٢٩).

واتە: هەمووتان چاودێرن و هەمووتان لە ئاقار کۆمەڵەکەتان دا لێپرسراون، بەس لەو کاتانەدا کە نۆرەی ئێشکچییەتی دەگاتە سەر،

---

(١) گورزی فیتووی: جۆرە یارییەکە پێویستە هەمیشە ئەوپەڕی وریایی تێدا ڕەچاو بکرێ، ئەگەرنا: بابای سست و خاو دەدۆڕێ و، گورزی بەردەکەوێ.

خۆی بە ئێشکچیی لەقەڵەم نادات، بەڵکو هەموو دەمێ، خۆی بەچاودێر و پاسەوانی ئیسلام و مسوڵمانان دەزانێ.

سەبارەت بەچۆنییەتی ئێشکەگرتنیش ئەم ئامۆژگارییانەمان بۆ موجاهیدە بەڕێزەکان، هەن:

(أ) - هەرچەندە بابای مسوڵمان هەموو دەمێ بەرپرسیارە، سەبارەت بە ئیسلام و مسوڵمانان، بەڵام بەتایبەتی لەدەمی ئێشکەگرتن دا، ئەو بەرپرسیارییەی دووچەندانە و چەند چەندانە دەبێتەوە، چونکە لەو دەمی دا، چارەنووسی ئیسلام و مسوڵمانان و ئابڕوویانی، پێ سپێرراوە!!

(ب) - بابای ئێشکچیی (حارس) نابێ لەخەم تۆزە ئەزیەتێکەوە بێ و، لەبەر لەش تەڕ نەبوون، یان سەرما نەبوون، وەک داوەڵ لەجێیەکی دیاریکراودا ڕاوەستێ، بەڵکو دەبێ هەر چاوێکی بکاتە چوار چاوو لەشوێنێکی وادا خۆی مەڵاس بدات، یان ڕاوەستێ، کە ئاگاداری دەورووبەرەکەی بێت و، نێوە نێوەش، لەکاتی پێویستیی دا بگەڕێ و، ئەملا و لایان بپشکنێ.

(ج) - نابێ بابای ئێشکچیی خۆی بەهیچ خەریک بکات، کە ببێتەهۆی بێ ئاگایی، با ئەو شتە: زیکر کردن و، قورئان خوێندنیش بێ، چونکە ئەگەر مەبەستی پاداشتە، ئێشکە گرتنەکەی - بەمەرجێک بە وریایی و بەرێک وپێکیی بێت - لەهەموو شتێک خێرترە.

(د) - نابێ بابای ئێشکچی، کە نۆرەی دەگاتە سەرو لەخەوێ هەڵدەستێنرێ، تەوەزەلیی و قاڵب گرانیی پیشان بدات و، لەبن جێی دا

خۆی بگنخێنێ، یان بەساردو سڕیی خۆی وەپێچێ، چونکە دوایی هەرشتێک بەهۆی خۆ گنخاندنی وییەوە ڕوودات، هەموو ئۆباڵ و تاوانەکەی لەملی وییە.

(هـ) - ئەو کەسەی نۆرەی ئێشکەگرتنی خۆی تەواودەکات و، دەیەوێ ئەوەی دوای خۆی وەخەبەر بێنێ، نابێ بە خاووخلیچکیی ئەو کارە بکات و، زۆر لەژووریێ بمێنێتەوە، یان زۆر خۆی بەبێدار کردنەوەیەوە خەریک بکات، بەڵکو پێویستە گورج و گۆڵ بێ و، ئەگەر زانی: کابرا بەسێنایی وەخەبەرنایەت، با کت و پڕ پێخەفەکەی لەسەر لابدات و، تێکیەوە ڕابشەقێنێ، بەڵام واش نا کەشێتی بکات!!

(و) - پێویستە برایانی ئێشکچیی لەکاتی یەکدی بێدارکردنەوەدا، بەئەسپایی و ئارامیی ئەو کارە ئەنجام بدەن و، نەیکەنە هات و هاوار و گاڵە و، خە و لەوانی دیکە تێک بدەن.

### ٧ـ خواردن سازکردن (خەفەریات - الخفارة - ):

خزمەتکردنی مسوڵمانان، کە جۆرێکە لەسوود پێ گەیاندنیان، بەیەکێك لە گەورەترین شێوە و جۆرەکانی خوا پەرستیی دادەنرێ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعهُم للنّاسَ)) (أخرجه القضاعي في (مسند الشهاب) برقم: ١٢٣٤).. واتە: باشترین کەس ئەوەیە، کە سوود بەخەڵکی دەگەیەنێ.

**دەربارەی چۆنییەتی خواردن سازکردنیش، ئەم ئامۆژگارییانەم بۆ برایانی پێشمەرگە هەیە:**

**(أ)** - دەبێ بابای خەفەر و خواردن سازکەر هەوڵ بدات ئەو خواردنەی کە ئامادەی دەکات، بەچاکترین و، پەسەندترین شێوە ئامادەی بکات، دەنا هەر کەم و کوڕییەك لەخواردنەکەدا هەبێ، بەهۆی خۆ بواردنی وییەوە، بەئەندازەی خەساربوونی خواردنەکە و، کەم و کوڕییەکەی، تاوانبارە.

**(ب)** - پێویستە خواردنەکە، لەگەڵ ژمارەی کەسەکان دا پێکەڵپێک بێ و، نەبەهۆی ڕژدییەوە، کورتی بێنێ و، لەبەریان ببڕێ و، نەبەهۆی زیادەڕۆییەوە لێیان زیادبێ و خەساربێ.

**(ج)** - پێویستە خواردنەکە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، نەزووتر، نەدرەنگتر، ئامادە بکات.

**(د)** - پێویستە لەشۆردنی مەنجەڵ و قاپ و کەوچکەکان دا، ئەوپەڕی پاک و خاوێنیی ڕەچاو بکات و، کەمتەرخەمیی نەنوێنێ، هەروەها سفرەی نان لەسەر خواردن، چاک پاک بکاتەوە.

**(ه)** - پێویستە ئەوپەڕی دادگەریی بەکاربێنێ، لەدابەش کردنی خواردنەکەدا و، مەگەر بۆ تام و خوێ زانین، دەنا تاقە پارووێک پێش کاتی نان خواردن، نە بخوات، نەبدات بەکەس.

**(و)** - ئەگەر گەسک لێدانی ژووریش عایدی وی بێ، پێویستە هەوڵ بدات لەنۆرەی ویدا، ژوورەکە یەکجار پاک بێت و، بابای نوێژکەر

لەکاتی کڕنووش بردندا، سەری سەتحی نەبێ و نەزانێ لەبەر خشپ و خاڵ، سەر لەکوێ دانێ!!

(ز) - نابێ لەبەرانبەر خزمەت کردنەکەدا، منەت بەسەر هاوەڵانی دا بکات و خزمەتەکەیان بە چاوان دا بداتەوە، چونکە یەکەم: ئەرکی سەرشانی خۆی جێ بەجێ کردوە، دووەم: پاداشتی لە لای خوایە.

**سەرنجێکی گرنگ:** لەباسەکانی پێشەوەدا گوتمان: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەرگیز عەیب و ڕەخنەی لەخواردن نەگرتوە، ئەگەر حەزی لێ کردبێ خواردوویەتی و، ئەگەر نا وازی لێ هێناوە، کەواتە نابێ هیچ کام لەبرایانی پێشمەرگە لەکاتی هەبوونی کەم وکوڕیی دا، دەست بکەن بە ڕەخنە و توانج و پلار، دەربارەی بابای خواردن سازکەر، چونکە دڵ بریندارکردنی مسوڵمان تاوانە و، پێم وانیە هیچ کەسیش حەزبکات پەرێز و بەرهەم و کردەی دەستی خراپ و ناتەواوبێ، ئەگەر گریمان بابای خواردن سازکەر، بەهۆی کەمتەرخەمییشەوە خواردنەکەی ناتەواو دەرچووبێ، هەموو کەس بۆی نیە گلەیی و گازندە دەربڕێ و مشوورخۆر و لێپرسراوی بنکە، بەو کارە هەڵدەستێ.

## ٨ـ وریایی و چەک لەخۆ نەکردنەوە:

یەکی دیکە لەو ڕەوشتە پەسەندانەی کە پێشمەرگەی ئیسلامیان پێوە دەناسرێ، ئەوەیە کەهەتا بەخەبەربێ لەکاتی شێنەیی دا و، ئەگەر نووستووش بێ، لەکاتی مەترسیی دا، چەک لەخۆی ناکاتەوە و هەموو دەمێ وریا و ئامادەیە، چونکە خوا بە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری فەرمووە:





﴿...وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ ...﴾ (النساء:١٠٢).

واتە: ئەگەر ئازارێکتان هەبوو، بەهۆی باران ـ و لەش تەڕبوون ـ ەوە یاخود ناساغ بوون، گوناحتان ناگاتێ کە چەکەکانتان دانێن و، ئامادەیی خۆتان وەربگرن.

وەك دەبینین [لاجُناحَ عَلَيْكُمْ] بەس دوو حاڵەتی بۆ دیاریی کراون، کەوابێ لەغەیری ئەو دوو حاڵەتەدا، مسوڵمانی موجاهید گوناحی دەگاتێ چەک لەخۆی بکاتەوە.[1]

أ- ئازار بەهۆی بارانەوە.

ب- نەخۆشی و نەتوانین.

## ٩- خزمەتکردنی چەک:

چەکی دەستی پێشمەرگەی ئیسلام، موڵکی ئیسلامە، هەر جۆرە کەمتەرخەمییەک لە خزمەت کردن و پاک ڕاگرتنی دا، دەبێتە مایەی تاوانباریی، چونکە ناپاکیی کردن لەگەڵ سپاردە (أمانة)دا تاوانێکی یەکجار مەزنە.

---

(١) ئەو حوکمە لەچەمکی پێچەوانەیی (مفهوم المخالفة)ی ئایەتەکە وەردەگیرێ و، پێم وانیە هیچ گرێ و گۆڵیشی تێدابن.

ئنجا پێشمەرگەی ئیسلام لە خزمەتکردنی چەکەکەی دا، زۆر خەمخۆر و بە مشوورە و، دەزانێ کە تەنبەڵیی کردن لە خزمەت کردنی چەکەکەی دا، لەدوولاوە گوناحباری دەکا:

(أ) - کە ناپاکیی لەگەڵ سپاردەدا کردوە و، زیانی بە ئیسلام و مسوڵمانان گەیاندوە.

(ب) - بەهۆی خزمەت نەکردنی چەکەکەیەوە، زۆر نزیکە لە ناسکترین کات دا، لەکاتی بەرەنگاریی دوژمن دا، چەکە خزمەت نەکراوەکەی، لەفریای نەیەت و بارێ بنەوەی پێ ببڕێ و، دەستە و کەری پێنەکرێ و، چەکەکەشی بەزمانی حاڵ پێی بڵێ: ئەگەر خزمەتت بکردبام خزمەتم دەکردی، بەڵام بیخۆ عافێتت بێ!!.

## ١٠ـ دەست لەچەك وەرنەدان، لەنێو خەڵکی دا:

کە دەڵێین: پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام خزمەتی چەکەکەی بکات، مانای ئەوە نیە هەموو دەمێ: بیکاتە بووکەشووشە و هەڵی پەرێنێ و دەستی تێ وەربدات، بەڵکو پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام بەبێ پێویستیی دەست لە چەکەکەی وەرنەدات، بەتایبەتی لەنێو خەڵکی دا، دەنا هەر شتێکی لەدەستی بقەومێ، مادام کەمتەرخەمیی کردبێ موستەهەقی سزای دنیا و دوا ڕۆژە.

## ١١ـ چەک ڕانەداشتن بەرە و ڕووی یەکدی:

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((لايُشِرْ أَحَدُكُمْ إلى أَخِيْهِ بالسِّلاحِ.)) (أخرجه البخاري برقم: ٦٦٦١، ومسلم برقم: ٢٦١٧).. واتە: هیچ کامتان چەک بەرە و ڕووی برایەکەی ڕانەدێرێ.

هەروەها فەرموویەتی: ((مَنْ أَشارَ إلى أَخِيْه بحَديْدَةٍ، فَإِنَّ المَلائِكَةَ تَلْعَنُهُ حَتَّى ينزع، وَإِنْ كانَ أَخاهُ لأَبِيْهِ وَأُمِّهِ)) (أخرجه مسلم برقم: ٢٦١٦)... واتە: هەرکەسێک تیغێک بەرەو ڕووی برایەکەی ڕادێرێ، ئەوە فریشتەکان نەفرینی لێ دەکەن، هەتا وازدێنێ، تەنانەت ئەگەر برای دایک و بابیشی بێ.

## ١٢ـ تەقە نەکردن و فیشەک خەسار نەکردن، بەبیانووی ڕاووشکار و نیشانە داکردن و.. هتدەوە:

مەگەر لەکاتی پێویست و تایبەتدا و، بەئاگاداری و مۆڵەتی سەرەوەی خۆی، ئەگەرنا نابێ تەقە بکرێ، چونکە ماڵ بەزایەدان و زیادەڕۆیی هەر لەخواردن و خواردنەوەدا نیە و، فیشەک و تەقەمەنیش بۆ موجاهید، جاری وایە لەخواردن و خواردنەوە پێویستترە.

## ١٣- دەستکاریی نەکردن و دەست تێوەر نەدانی ئەو جۆرە چەك و تەقەمەنییانەی، کە شارەزایی و پسپۆڕی تەواوی لەبارەیانەوە نیە:

مەگەر لەکاتی پێویست و تەرخان کراودا و، بەمۆڵەتی سەرەوەی خۆی، ئەگەرنا نابێ دەست وەربدرێتە چەك و تەقەمەنی، چونکە بەپێچەوانەوە: بەتاوان و سەرپێچیی لەقەڵەم دەدرێ و بابای سەرپێچیکار گوناحبار دەبێ.

## ١٤- سروشت و سیمای بنکە (مقر)ێکی ئیسلامیی:

هەروەك چۆن هەرکام لەموجاهیدەکانی ئیسلام، خاوەنی سروشت و کەسایەتییەکی تایبەتی ئیسلامییانەیە و، لەخەڵکی دیکە جیایە، دیارە بنکە و بارەگایەکیش کە موجاهیدەکانی تێدان، سروشت و سیمایەکی تایبەتی ئیسلامییانەی هەیە، کە جیای دەکاتەوە لەشوێن و جێگای هەر کۆمەڵێکی دیکە، ئنجا ئێمە دەتوانین هەروا بەکورتیی سروشت و سیمای بنکەیەکی ئیسلامیی، لەم حەوت (٧) خاڵانەدا بخەینەڕوو:

**یەک:** لەبنکەی ئیسلامیی دا، سیما و جەووی عیبادەت، مۆرکی گشتییە و، بانگ و قامەت و، نوێژی بەجەماعەت و، ڕۆژووی سوننەت و، قورئان خوێندن و، زیکر و فیکر و.. هتد، چەند پێکهێنەرێکی سەرەکیی ئەو بارودۆخ و مۆرکە گشتییەن.

**دوو:** فێربوون و فێرکردنی زانیارییە جۆراوجۆرەکانی ئیسلام، وەك: تەفسیری قورئان و، شەرحی سوننەت و، سیرەی پێغەمبەر (صل الله

علیه وسلم) و، عەقیدەی ئیسلامیی و، شەرع و، تەزکیە و، سیاسەتی شەرعیی..

**سێ:** برایەتیی و تەبایی و، پرس و ڕاوێژ بەیەکدی کردن، لەڕاپەڕاندنی کاروبار و مشوور خواردن دا.

**چوار:** هێمنیی و ئارامیی و، ڕەچاوکردنی دەستوور و ئەدەبە شەرعییەکان، لەهاتن و چوون و، بەرو مەجلیس و، قسەکردن و، بانگی یەکدی کردن و، هەر جم و جۆڵ و هەستان و، دانیشتنێکی دیکەی نێو بنکەدا.

**پێنج:** ڕێز و حورمەت و ویقار و نەزاکەت، لەنێو ئەندامانی بنکە و لەگەڵ خەڵکیش داو، خۆپاراستن لەهەر جۆرە قسە وکردەوە و ڕەفتارێك کە بۆنی بێ ڕێزیی و بێ نەزاکەتیی لێ بێ.

**شەش:** ڕێکوپێکی (نظم) لە بەڕێوەبردنی کاروبار، لەهەموو ڕوویێکەوە و، دووریی لەپشێویی و ئاڵۆزیی و بێ سەرووبەریی.

**حەوت:** گورج و گۆڵیی و وریایی و چالاکیی و، خۆپاراستن لە خاووخلیچکیی و سارد و سڕیی و تەوەزەلیی، لەهەموو بارێکەوە و، گرنگیدان بەو جۆرە وەرزشانەی کە لەگەڵ جەووی بنکەدا دەگونجێن و، دەبنە هۆی بەهێز کردن و ڕاهێنانی جەستە، بۆ باش ڕاپەراندنی ئەرکەکانی.

بەکورتیی: بنکە و بارەگایەکی ئیسلامیی، پێویستە قوتابخانەیەکی پەروەردە و بارهێنانێکی هاوسەنگی شەرعییانە بێت، کە عەقڵ و ڕووح و جەستەی موجاهیدانی، لەیەك کات دا و، بەشێوەیەکی هاوسەنگ (متوازن) تێدا پەروەردە بێ و گەشە بکات.




## شێوەی ڕەفتارکردنی پێشمەرگەی ئیسلام لەگەڵ میواندا

ڕێز گرتنی میوان، یەکێکە لەڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام و، ئەرکی سەرشانی هەموو مسوڵمانێکە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ، فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ..)) (أخرجه البخاري برقم: ٥٦٧٣، ومسلم برقم: ٤٨).. واتە: کێ بڕوای بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانەکەی بگرێ.

بەر لەوەی بێینە سەرباسی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی هەڵوێستی پێشمەرگەی ئیسلام، لەگەڵ هەریەک لەو جۆرە میوانانەدا کە دێنەلای، دە (١٠) ئامۆژگاریی و ئاگاداریی گرنگی گشتی، دەربارەی ڕێزگرتنی میوان دەخەینەڕوو:

**یەک: پێشوازیی کردن و بەپیرەوچوون:**

سوننەتە کە میوانت هات، بەپێی لێوەشاوەیی و هەڵگرتنی ئەو میوانە، پێشوازیی لێ بکەی و، بەپیریەوە بچی، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جارێکی زەیدی کوڕی حاریسە لەسەفەرێک گەڕایەوە و هاتە خزمەتی و لەدەرگای دا، ئەویش هەستا بەپیریەوەچوو، عەباکەی لەدوای خۆی ڕادەکێشا.. وەک (ترمذي گێڕاویەتەوە).

**دوو: ڕووخۆش بوون:**

وەک لەپێشەوە باسمان کرد: یەکێک لەو شتانەی سیما و دیمەنی مرۆڤی مسوڵمانیان پێ دەناسرێ، بریتیە لە ڕووخۆشیی و گفت و لفت شیرینیی، بەتایبەتی لەگەڵ میوان دا.

**سێ: تۆقەکردن**

وەک پێشتر خستمانەڕوو: تۆقەکردن لەنێو مسوڵمانان دا، سوننەت و لەگەڵ میوانیش دا، حەوت جار حەوت جار، پەسەندە، ئەگەر پێویستیش نەبێ، لە کاتێکدا بەپێی عورف و باو، دەبێتە مەرجی ڕێز لێگرتنی میوان.

**چوار: دانیشتاندنی لەلای سەرێ:**

واباشە خانەخۆێ لە میوانەکەی وەپشت نەکەوێ و، لای سەرێی لێ نەگرێ، چونکە بە گوێرەی عورف و عادەتی خەڵکی، کەسێك ڕێزی لێ بگیرێ دەبرێتە سەرەوەی مەجلیس.

### پێنج: پەلە كردن لە خواردن و خواردنەوە پێدانی دا:

بابای ڕێبوار مەگەر چۆنەكایی، دەنا تینوو و برسییە، ئنجا چاكتر وایە دەستبەجێ خواردن و خواردنەوەی بۆ سازبكرێ، با كاتی (ژەم)یش نیزیك بێ، مەگەر بۆخۆی بڵێ: جارێ ناخۆم.

### شەش: چاوتێ نەبڕینی لەكاتی نان خواردن دا:

شتێكی ناشیرینە كە بابای خانەخۆی لەكاتی نان خواردن دا، چاو لەدەستی میوانەوە ببڕێ و، وا پێشان بدات كە چاودێریەتی و، ئەویش وای بێتە بەرچاو: كەپاروەكانی دەژمێرێ!!

### حەوت: سەغڵەت نەكردنی، بەهۆی قسە و پرسیاری بێ جێوە:

میوان دەپرسیاران گرتن و، سەغڵەت كردنی، بەهۆی پرسیاری نابەجێ و سەغڵەتكەر (محرج)ەوە، شتێكی زۆر ناقۆڵایە و لەمسوڵمانی موجاهید ناوەشێتەوە.

### هەشت: دەورە چۆڵ نەكردنی و، بەتەنیا بەجێ نەهێشتنی:

واچاكە هەموو دەمێ، یەكێك یان زیاتر لەبرایانی پێشمەرگە لەلای میوان دانیشن و، بەتەنێ بەجێی نەهێڵن، چونكە ئەو ڕەفتارە بۆنی گرنگیی پێ نەدان و، بێ ڕێزیی لێ دێ، هەروەها ئەمە دووربینیی و وریاییشی تێدایە، بۆ هەندێك جۆرە میوان،

**نۆ: دم بەدمە لەگەڵ نەکردنی و هەست پاراستنی:**

واباشە: خانەخوێ هەتا بۆی دەکرێ، لەگەڵ میوان دا شەڕە قسە و دم بەدمە نەکات و لەدەماری نەدات و، هەست و نەستی بریندار نەکات، بەڵام ئەگەر ئەو بارودۆخێکی وای هێنایە پێش، کە خانەخۆی، ناچارکرد، پێویستە ڕێك و ڕاست، هەقی بخرێتە بەرچاوو، بۆی لەبنی کوولەکە بدرێ، بەڵام هەتا بلوێ، بەشێوازی پڕ ڕێز و حورمەت و حەکیمانە.

**دە: لەگەڵ چوونەدەرەوەی و بەڕێ کردنی:**

واباشە لەکاتی ڕۆیشتنی میوان دا، بەئەندازەی هەڵگرتن و لێوەشانەوەی، بەڕێزەوە بەڕێ بکرێ و، کە سێک یان پتر لەگەڵی بڕوات.

ئێستاش دێینە سەر باسی چۆنیەتی ڕەفتار کردنی پێشمەرگەی ئیسلام، لەگەڵ هەرکام لەوجۆرە میوانانەدا، کە دێنەلای، کەبەبڕوای من، لەپێنج جۆران دەرناچن:

**١ـ شوێن کەوتووی حیزبە نا ئیسلامییەکان:**

وێڕای ڕەچاو کردنی ئەو دە (١٠) خاڵەی کە ڕابردن، پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام، هەوڵ بدات بەر لەزمانی وتار، بەزمانی حاڵ و واقیع و ڕەفتار، ئیسلامێکی ڕێک و ڕاست، بخاتە بەرچاوی و،

بەپێی بۆ لوانیش، خۆی لەوجۆرە باسانە بپارێزێ، کە سەردەکێشن بۆ دم بەدمە و شەڕە دەندووکە، مەگەر لەحاڵەتی زۆر ناچاریی دا، دەنا بەهیچ شێوەیەک ڕاستەوخۆ لەبیروباوەڕ و هەست و نەستی نەدات، چونکە یەکەم: وەک میوانێک مافی هەست و نەست پارێزرانی هەیە، دووەم: خوا فەرموویەتی:

﴿ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ (الأنعام:١٠٨).

واتە: جنێو بەو شتانە مەدەن، کە (بێبڕوایەکان) لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، ئەگەرنا ئەوانیش بە نەزانیی (خەتێ خواردەکەن و) جنێو بەخوا دەڵێن.

بەڵام ئەوە لەحاڵەتی ئاسایی دا، ئەگەرنا ئەگەر هات و بارودۆخەکە ناچاری کردی، وەک ئەوەی ئەو هێرش بکاتە سەر ئیسلام و، تۆمەتی نەفامانەی پاڵداتەلا، ئەوە لەحاڵێکی وادا، حورمەتی میوانایەتیی خۆی شکاندوە و، بۆتە هێرش بەر (مهاجم)، هەڵبەتە بابای هێرش بەریش دەبێ بەرپەرچی بدرێتەوە، چونکە (جوابی تەحە، پەحەیە) و بەپێی ئایەتی:

﴿ ...فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ... ١٩٤ ﴾ (البقرة: ١٩٤).

ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، بەڵام دەبێ وریابین و بەهۆی هەڵچوونەوە، تووشی زیادەڕۆیی و شێوازی نەگونجاو نەبین.

## ٢ـ کەس و کاری پێشمەرگە:

کەس وکاری پێشمەرگە، هەرکەسێکی بێ و هەرچۆنێکی بێ یەکەم: لەبەر میوانایەتیی، دووەم: لەبەر دڵ ڕاگرتنی برای پێشمەرگە، پێویستە ئەوپەڕی نەرمیی و هێواشیی لەگەڵ بەکاربهێنرێ و، ئەگەر غەڵەت و پەڵەتانیش بکات، پتر لای لێبوردن و چاوپۆشیی بگیردرێ، هەتا وەڵام دانەوە و دەمکوت کردنی، بەڵام بەمەرجێک لە تامی نەباتە دەرێ، کوردیش گوتوویانە: (هەموو شتێک بەخوێ و خوێش بەمەعنا)!! واش باشە کەس و کاری پێشمەرگە، هەوڵی حاڵی کران و تێگەیاندرانیان لەگەڵ بدرێ و، هەوڵ بدرێ قەناعەتیان پێ بهێنرێ بە گرنگیی و پێویستیی کاری ئیسلامیی بەگشتی و بەتایبەتی جەنگ و جیهاد.

## ٣ـ کاروانچـیـی[١] :

ئەو برادەرە کاروانچییانەی کە بارمان بۆ دێن، پێویستە پێشمەرگەی ئیسلام لە دوورڕا بەپیریانەوە بچێ و، ڕیشمەی وڵاخەکەیان لێ

---

(١) هەرچەندە ئەم برگەیە کەمتر پەیوەندیی بە واقیعی ئێستامانەوە هەیە، بەڵام قرتاندنیم بەباش نەزانی، چونکە بەزادە و هەڵقوڵاوی قۆناغێکی گرنگ و واقیعێکی بەپێزی دەزانم لەمێژووی کاری ئیسلامیی دا، کە خەباتی شاخ و ڕۆژانی فیداکاریی و بەرخۆدانە، گوتم با بۆیادگاریی ئەو قۆناغە سەخت و دژوارە و، وەفاداریی بۆ ڕەنج و کۆششی ئەو برا کاروانچییە ماندوو نەناسانە، هەر بمێنێ.

وەربگرێ و، بارەکە بخات و، بیباتە شوێنی تەرخان کراوی خۆی و، وڵاخەکە ببەستێتەوە و، نەهێڵێ بابای کاروانچیی دەست لەهیچ شتێک بدات و، دەستبەجێ بیهێنێتەوە ژووری و، دەست بکات بەخزمەت کردنی و، بەخێرهێنانی و هەواڵ پرسینی، مەگەر لەحاڵێک دا کە بابای کاروانچیی بۆخۆی دڵی ئاوێ نەخواتەوە و، بڵێ: بۆخۆم وڵاخەکەم دەبەستمەوە و ئالیکی دەدەمێ.

### ٤- بابای نەناسراو:

بابای نەناسراویش، وەک هەموو جۆرە میوانەکانی دیکە، بەخێر دەهێنرێ و، بەو شێوەیەی کە گوتمان ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ و، ئەوپەڕی وردیی و وریایی و لێزانیی بەکاردێ، لەکاتی قسە لەگەڵ کردنی دا، نەوەک شتێکی لەبن سەری دا بێ، یان قسەکان لەگەڵ وی دا نەگونجێن.

### ٥- خەڵکی دیکەی ناسراو:

خەڵکی دیکەی ناسراو، هەرکەسە بەپێی ئەندازەی عەقڵ و ئاستی حاڵی بوونی و پێویستیی، قسەی لەگەڵ دا دەکرێ و، بەو شێوەیەش کە ڕابرد، هەڵس و کەوتی لەگەڵ دەکرێ.

**سەرنج:** لەهەر بنکەیەکی موجاهیدەکانی ئیسلام دا، کەسێکی وریا و لێهاتوو، یان چەند کەسێکی وریا و لێهاتوو، تەرخان دەکرێن بۆ گفت و

گۆ و دوان لەگەڵ میوان دا و، جگە لەوان، نابێ کەسی دیکە خۆی لەقسان هەڵقورتێنێ، چونکە: ((مِنْ حُسنِ إسلام المَرْءِ تَرْكُهُ ما لايَعْنِيْهِ)) (رواه أحمد والترمذي).

پێشینانیش پەندێکی جەرگبڕیان داناوە، بۆ هەرکەسێک کە خۆی لە ئیشێکەوە هەڵدەقورتێنێ، کە لێی ناوەشێتەوە و پێی نەسپێرراوە، دەڵێن:

(فڵانە کەس لەهەمووو دیزان خۆی دەکاتە ئەسکوێ!).

# پاشكۆ

لەسۆنگەی ئەوەوە، کە ئەم بەرهەمە: دەوری دە (١٠) ساڵ لەمەوبەر[1] نووسراوە و، ئەوکاتەش کاری ئیسلامیی و، ئەندام و پێشمەرگەکانیشی لە بارودۆخێکی دیکەی جیا، لە بارودۆخی ئێستا دابوون، بەپەسەندم زانی: لەم پاشکۆیەدا، ئەگەر بەکورتییش بێت، ئاماژە بۆ چەند مەسەلەیەک بکەم، کە پێشمەرگە و دۆست و لایەنگرانیشمان، پێویستییان پێیان هەیە:

١ـ ئیسلام لەبارودۆخی ئەمڕۆی کوردستاندا، بۆتە تاقە ئومێد و هیوای زۆربەی زۆری خەڵکی و، سەرەنجام جەماوەری کورد، تێگەیشتن کە ڕێچکەو کوێرە ڕێیەکان، جگە لە چاووڕا و قسەی بریقەدار و بۆش، هیچیان لە هەگبەدا نیە و، نەک هەر خەون و خەیاڵی خەڵکیان پێ نایەتەدی، بەڵکو بەرهەمی خەم و خەباتی چەند ساڵەشیان، لێ بەتاڵ دەکەنەوە.

کەوابێ پێویستە ئەندام و پێشمەرگەکانی ئیسلامیش، لەئاستی بەرزی ئومێد و چاوەڕوانیی خەڵکی دابن. دیارە ئەگەر خوانەکردە واش نەبن، ئەواناوی (مسوڵمان)یان لێ خەسار دەبێت!!

---

(١) ئەو پاشکۆیە هی چاپی دووەمە، ئەگەرنا ئێستا: [٢٠١٩/١١/٢ز - ٥ ربیع الأول ١٤٤١ك] سی و یەك (٣١) ساڵ بەسەر چاپی یەكەم دا (١٩٨٨ز) تێپەڕیوە.

**٢ـ** هەرچەندە دەردە کۆن و لەمێژینەکان، کەم و زۆر هەرماون، بەڵام لە سایەی لوتفی خوا و هەقانیەتی ئیسلام و، ڕەنج و خەباتی ئەندام و پێشمەرگە دڵسۆز و فیداکارەکانیەوە، ئێستا کار و جم و جۆڵی ئیسلامیی چۆتە قۆناغێکەوە، کە وەك چەند ساڵێک لەمەوبەر، بەنامۆیی سەیری ناکرێ و، لەلایەن زۆربەی هەرە زۆری خەڵک و جەماوەرەوە، لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای ناکرێ و، تۆمەتی بێجێ و ناڕەوای وەپاڵ نادرێ، بەڵکو بەپێچەوانەشەوە جم و جۆڵ و تەوژمیی ئیسلامیی، ئێستا بۆتە جێگای ڕێز و تەقدیر و متمانە و باوەڕی جەماوەر و، خەڵکی هەزار و یەک خەونی خۆشی پێوەدەبینن و، ئومێد و هیوایەکی زۆریان پێیەتی.

بەکورتیی: ئەمڕۆ خەڵکێکی زۆر ڕووی لە تەوژمی ئیسلامییە و بەهیوای ئەوەن، کە بتوانێ ماڵی خۆی چاک ڕێک بخات و، خانەخوێیەکی وابێت، کە پێشوازیی گەرم و گوڕ و لێزانانە، لەمیوانەکانی خۆی بکات و بۆ هەر کامێکیشیان، جێگا و ڕێگای لەبار و شایستە دیاریی بکات!

**٣ـ** چەند ساڵێک لەمەوبەر: تەوژمی ئیسلامیی جیهادیی، تاقە سوارەی مەیدان بوو لە کوردستان دا، بەڵام ئێستا لایەن و تەوژمی دیکەش پەیدابوونە، کە دەیانەوێ لەو مەیدانەدا، ئەسپی خۆیان لینگ بدەن، ئنجا پێویستە ئەندام و پێشمەرگەکانی ئیسلام، ئەو ڕاستییە بزانن کە ئەوانیش برا و هاوسەنگەرینی و، هەموویان ڕێبواری یەک ڕێن.. نەهیچ کەسێکیش ڕێگە لەکەس دەگرێ و، نەکەسیش بەشی کەسی پێ دەخورێ و، ڕێبازی خواش هەتا خزمەتکاری زۆربن، هەر کەمن و، مادام ئامانج و مەبەستیش یەک بێت، جیاوازیی

بیروبۆچوون و سەلیقە لەشێوەی کارکردن دا، زیانی نیە، بەڵام بەمەرجی ئیخلاص و پابەندیی بەشەرع و، زەمینە سازیی بۆ یەکخستنی توانا و وزەکان و، دابەش کردنی کار و چالاکییەکان، بەپێی پسپۆڕیی و لێهاتوویی.

٤ـ پێشمەرگەی ئیسلام، دەبێ هی ئیسلام بێت و، خۆی بەپەرژینی باغی ئیسلام و قەڵای مەحکەمی مسوڵمانان بزانێ و، دەبێ زۆر خۆی لەڕووحی تەسکی لایەن لایەنیی، بپارێزێ و، هەموو دەمێش بۆ دیفاع و بەرگریی لە ئیسلام و موقەددەساتی و، خەڵکی مسوڵمان و مەزڵووم، ئامادەبێ و، خەنجەری بەرپشتێندی هەر مسوڵمانێک و قەڵغان و سوپەری هەر لێقەوماوێک بێ!!

٥ـ پێشمەرگەی ئیسلام، خاوەنی ڕەوشت و خووی هەرە بەرز و شیرین و، ڕێز و حورمەت و قەدر زانینە، بۆ هەموو کەس بەتایبەت زانایانی ڕەسەنی ئیسلام و، ڕیش سپی و پیاو ماقووڵان و، خەڵکی بەتەمەن، چونکە دەزانێ کە خوای کاربەجێ مەدحی پێغەمبەری خۆی بە: [وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمْ] کردوە و، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دەستووری: ((لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيْرَنا، وَيَعْرِفْ شَرَفَ كَبِيْرِنا))[1] فێری کردوە!!

٦ـ هەرچەندە خەسڵەتی فیداکاریی و جەنگاوەریی، دیارترین خەسڵەتی پێشمەرگەی ئسلامە، لە دوای ئیمان و تەقوا، بەڵام بەردەوام و بێ

---

(١) (صحيح)ە، ئەبوو داوود و تیرموذیی گێڕاویانەتەوە، بڕوانە: (رياض الصالحين)ی نەوەویی، ژمارە (٣٥٩)، (ل: ١٧٣).

پسانەوەش، هەوڵی ئەوە دەدات، کە وەك هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، خوا لێیان ڕازی بێ، بێت.

مسوڵمانێکی تێر و تەواو و هاوسەنگ بێ و، بتوانێ لەهەموو مەیدانێک دا، ئەسپی خۆی تاوبدات، بەکورتیی: پێشمەرگەی ئیسلام هەوڵ دەدات: هەم نوێژکەری باش بێت، هەم جەنگاوەری کارامە، هەم ئەهلی زیکر و فیکر بێت، هەم هۆشیاریی و سیاسەت، هەم پیاوی دنیابێ و هەم هی قیامەت.

**٧ـ** ئەندام و پێشمەرگەکانی ئیسلام: کە لەبازنەی کۆمەڵ دا خۆیان دەبیننەوە ـ دەبێ لەهەموو کەسێک سوورتر و بەتەنگەوەبووترین، بۆ یەکبوون و برایەتیی و یەکریزیی و یەکڕەنگیی، بۆیە ئەوەندەی شیریان بڕبکات و، شەرع ڕێگا بدات، خۆیان لەهەرقسە و ڕەفتار و هەڵس و کەوتێک دەپارێزن، کە ببێتە مایەی: دەمەقاڵێ و مشت و مڕ و پەرتەوازەیی، با ئەو قسە و ڕەفتارەش، بەسوننەت و ئەدەبێکی ئیسلامیی بزانن - وەك: هەندێک مەسەلەی فەرعیی لەبواری عیبادەتدا[1]و، بەعزە هەڵس و کەوتێکی نێو کۆمەڵگا - چونکە:

---

(١) وەك دەست لەسەر سنگ دانان و زۆرلێك بڵاوکردنی پێیەکان و، بەردەوام پەنجەی شایەتمان جووڵاندن و، لەبەر یەکدی هەڵنەستان لەکۆڕ و مەجلیس دا و، دەلینگە شەڕواڵ هەڵپێچان و... هتد. کە بەداخەوە هەندێک لە موجاهیدە سادە و کەم شارەزایەکان، کردوویانن بەبناغەی دۆستایەتیی و دوژمنایەتیی (الولاء والبراء) و سەنگی مەحەکی شوێن کەوتنی سەلەفی صاڵح!!

**یەکەم:** یەکبوونی (وحدة)ی مسوڵمانان، فەرزە و شتێکی بنچینەییە و دیارە شتی جوزئیی و گچکەش، بەقوربانی شتی گەورە و بنچینەیی دەکرێ، ئەگەر نەگونجا پێکەوە کۆبکرێنەوە.

**دووەم:** ئەو مەسەلانە، بەس ئەو بارەیان سوننەت نیە، کە هەندێك خەڵك و کۆمەڵگای مسوڵمان بەشتێکی نامۆ و سەیریان دەزانێ، بەڵکو باری دیکەشیان هەیە، کە ڕەنگە هەندێکیان لەڕووی بەڵگەوە، بەهێزتریش بن، کەواتە: نەک هەر بێ حیکمەتیی بگرە بێ شەرعیی و هەڵەشە، کە پێ داگیری لەسەر ئەو مەسەلە فەرعیی و وردە بابەتانە بکرێ، لەقۆناغێکی ئاوادا، کە زیان لە یەکڕیزیی مسوڵمانان دەدات و، دەبێتە هۆی سەر گەرم بوونیان بەشتە لاوەکیی و جوزئییەکانەوە، لەسەر حیسابی مەسەلە گرنگ و بنچینەییەکان، کە بێگومان ئەوە ڕەفتارێکی بیدعەت و بێ حیکمەتە و، پێچەوانەی ڕووحی قوڕئان و سیرە و سوننەتیشە.

# بەرهەمەكانی دانەر

## أ - كتێبە كوردییەكان :

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| | قــورئــان و ســونـنـەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیســلام لەبەر ڕۆشنایی سورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {كۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟)و (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكـەم: ســوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : ســوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النسـاء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفســیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: ســوورەتی: (الـمائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٧ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سـوورەتی: (الأنعـام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی شەشەم : سـوورەتی: (الأعــراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| ١١ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | بەرگی دەیەم سوورەتی: (هود) | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسـیری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی یـازدەیــەم: سـوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| ١٤ | شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٥ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| **بیـروبڕواو فیكـری ئیسـلامیی** | | | |
| ١٦ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسـلام و ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ١٧ | پرۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٨ | بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیســلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١٩ | چەند مەسـەلەیەكی بـاوی سـەردەم، سـەرنجێكی واقیعییانەو هەڵسـەنگاندنێكی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی شەش / ٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و توركـی و فـارسـییش |
| ٢٠ | خواناسـی، ئاییـن، ئیمان (ڕاستییەكانی ئیسـلام دەدرەوشێنەوەو ئەفسـانەكانی ڕێچكان دەپووچێنەوە) | چاپی یەك/٢٠٠٢ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٢١ | ناوە هەرە جوانەكانی خوا سبحان وتعالى | چاپی یەكەم ٢٠١٣ | |
| | مەوسـووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا، (٦ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| ٢٢ | بەرگی یەكەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٢٣ | بەرگی دووەم: خوا بەیەكگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٢٤ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەكگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٢٥ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەكانی خوا، كتێبەكانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٢٦ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | |
| ٢٧ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەكانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٢٨ | ڕێبـــازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کامەیە ؟! | چـاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسـولمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسـوڵمان) |
| ٢٩ | مسـوڵمانی کـامڵ : بەشی یەکـەم : بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چـاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٣٠ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چـاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقـــە لە هەفتەنـامەی (هـاووڵاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٣١ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٢ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طـــەحاویی | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٣٣ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٤ | سیکۆلاریزم و دیموکڕاسیی لەئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| | مەوسووعەی: بیركردنەوەی ئیسلامی لەنێوان وەحیی و واقیع دا | | |
| ٣٥ | كتێبی یەكەم: پێناسەو چییەت و سەرگوزشتەو سەرچاوەكان و گرنگیی: بیركردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٦ | كتێبی دووەم: هێڵە گشتییەكانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٧ | كتێبی سێیەم: تەوژمە فیكرییە سەرەكییەكانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٨ | كتێبی چوارەم: پایەكانی بیركردنەوەی ئیسلامی | چاپی یەك / ٢٠١٨ | |
| ٣٩ | كتێبی پێنجەم: چەند پرسێكی فیكریی هەنووكەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك / ٢٠١٩ | |
| | فیقهـی ئیســلامیی | | |
| | مەوسـووعەی: خواپەرسـتیی ئیســـلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠ چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٤٠ | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاكء خاوێنیی | | |
| ٤١ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین دروشمی خواپەرستیی | | |
| ٤٢ | بەرگی سێیەم: زەكات و ماڵ بەخشین | | |
| ٤٣ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٤٤ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسـەکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چـاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێـڕراوە |
| ٤٥ | جـەژن و یـادو بۆنەکان و هەڵسـەنگاندنێك | چـاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٤٦ | چـەند بابەتێکـی هونـەریی لەبەر ڕۆشــنایی قوڕئـان و سـوننەتـدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمـانی فارسـییش تەرجەمـە کــراوە |
| ٤٧ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سـامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| | **تەزکیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاکــار** | | |
| ٤٨ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| ٤٩ | ڕێگای صالح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسـییش |
| ٥٠ | مزگەوتەکانی کوردسـتان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| ٥١ | گەڕانەوە بۆ لای خــوا (سـبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و وازهێنان لە گوناهو سـەرپێچیی و گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسـەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| ٥٢ | شـەهید کێیەو چ پلـەوپایەیەکی هـەیە !؟ | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٥٣ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٤ | گیانی ژیـــان، باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك کردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٥٥ | مەوســـووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیســـلامیی لەبەر ڕۆشـنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | **بانگـەوازو کـاری ئیســـلامیی** | | |
| ٥٦ | کۆمەڵـی خـــوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| ٥٧ | پێشمەرگەی ئیســـلام، یان مســـوڵمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی سێ/١٩٩٨ | |
| ٥٨ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیســـلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٩ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٦٠ | بزووتنەوەی ئیسـلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٦١ | چەند ڕێڕوونییـەك بۆ ئیســـلامییەکانی کوردسـتان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٦٢ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعی یەکان و بنچینە ئەخلاقی یەکان | چاپی ١ / ١٩٩٧ | |
| ٦٣ | ئیســـلام و کێشــە هەنووکەیی یەکـان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٤ | زانایانی ئیســـلام کێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگـێڕراوەتە سـەر زمانی عـەرەبی |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٦٥ | کۆمەڵی ئیسـلامیی: ئامانج و هەڵوێســتەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٦ | چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا بکەین؟! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٦٧ | چۆن لە جیهاد بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٦٨ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگاداررییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٦٩ | بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٧٠ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| ٧١ | چەند ڕێـڕوونییەك بۆ خوشـك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٧٢ | ئیسلام و مسولْمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٧٣ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٧٤ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناوونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵـگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٧٥ | هەڵوەشاندنەوەی بیـروڕاو ڕەفتارە پەڕگیـرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٦ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسـلام نەمانخاتە دوودڵـیی و گومان | چاپـی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٧ | پەڕگیـریی: پێناسـەی، نیشانەکانی پەڕگیـران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شـوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چـارەسـەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٧٨ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ٧٩ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی کاری ئیسلامیي | چاپی یەکەم ٢٠١٩ | |
| | **زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی** | | |
| ٨٠ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨١ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨٢ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژێرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| | **وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان** | | |
| ٨٣ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ٨٤ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ٨٥ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
| --- | --- | --- | --- |
| | **نەتەوایەتیی و مەسـەلەی کورد** | | |
| ٨٦ | کوردسـتان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ٨٧ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیـری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ٨٨ | سـۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسـیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسـلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠، چاپی دوو/ ١٩٩٨، چاپی سێ/٢٠٠٥، چاپی چوار/ ٢٠١٨ | |
| ٨٩ | چارەســەری کێشـەی کـورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| | **سـیاسـەت و حوکمڕانیی** | | |
| ٩٠ | چەند بابەتێکی سـیاسـی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشـنایی عەقڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | چاپی یەك / ٢٠١٤-٢٠١٦ | |
| ٩١ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ٩٢ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ٩٣ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان<br>جێبەجێکردن<br>دادوەریی | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ٩٥ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/ ٢٠١٧ | |
| ٩٦ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٩٧ | گرنگیی ڕەوشت لە سیاسەتدا. | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| | **ئافرەت و خێزان** | | |
| ٩٨ | ئافرەتی مسـولْمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣ | |
| ٩٩ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سایەی شـەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | **مـێـــژوو** | | |
| ١٠٠ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٠١ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٠٢ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداو و وێستگەکانی ژیانم | چاپی یەکەم/٢٠١٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **دیدارو گفتوگۆ** | | |
| ١٠٣ | سنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١ چاپی دوو/٢٠٠٤ | |
| ١٠٤ | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥ چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| ١٠٥ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |
| | **زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان** | | |
| ١٠٦ | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٠٧ | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢ چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠٨ | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٠٩ | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٠ | سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١١١ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٢ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٣ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١١٤ | بانگەواز بۆ لای خودا، چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١١٥ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٦ | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١١٧ | سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەمناملیکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ١١٨ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١١٩ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٢٠ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٢١ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١٢٢ | تاقیكردنەوەی خوا بۆ بەندەكانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٢٣ | ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٤ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسـەرێكی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٢٥ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆكار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٢٦ | ژیان لەسایەی ئیمانداو ڕەواندنەوەی گومانەكان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| **ب- كـتێـبـە عـەڕەبـیـەكـان** | | | |
| ١٢٧ | موسـوعة : الإسـلام كما يتجـلّى فـى كـتاب الله | ط الأولى/٢٠١٥ | كە لە چـاپی یەكەمدا (٨) بەرگـەو، لە چـاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبـێ، بەم شـێوەیە: |
| ١٢٥ | الكتاب الأول: الإسـلام: معرفة صحيحة بالخـالق عز وجل والخلـق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٢٦ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمـان | ط االثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٧ | الكتاب الثـالث: الإيمان بالله تبارك وتعالـى: الخالق الرب الـمالك الإله ذي الأسـماء الحسـنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروار و چاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١٢٨ | الكتاب الرابـع: الإيمان بالـملائكـة و بالـجـن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٢٩ | الكتاب الخامس: الإيمان بكـتب الله الحكـيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣٠ | الكتاب الســادس: الإيمان برسـل الله تعالـى وأنبيـائه الكــرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٣١ | الكتاب الســابـع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سـيـرته وبراهين نبـوَّتــه ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٢ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر ط الثانية / ٢٠١٨ | | |
| ١٣٣ | الكتاب التاسـع: إهتداء الإنســـان بهـدى الله، أو الإلتزام الفردي بشــريعة الله | | |
| ١٣٤ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | | |
| ١٣٥ | الكتاب الحـادي عشـر: تطبيق الـمجتمع للشــريعة و معــالم الدولة فـي الإســـلام | | |
| ١٣٦ | الكتاب الثاني عشــر: الإســـلام: نظــرة سـديدة تجــاه الناس وتعامل صحيح معهم | | |
| ١٣٧ | نقض فـكــرة التطــرف | "ط الأولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين)" | |
| ١٣٨ | ضــيف و قضــية (مقابلة مع قنــاة العربية) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٣٩ | لقاء خاص (مقابلــة مع قنــاة العــالم) | ط الأولى/٢٠٠٦ | |
| ١٤٠ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الأولى /٢٠١٦ | |
| ١٤١ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الأولى/٢٠١٢ | |
| ١٤٢ | أمير وراء القضبان | ط الأولى/ ٢٠٠٩ | |
| ١٤٣ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |

| ژ | كتێبەكان | بەروار و چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٤٤ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الأولى/ ٢٠١١ | |
| ١٤٥ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الأولى/ ٢٠٠٥ | ط الثانية / ٢٠١٨ |
| ١٤٦ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٧ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٤٨ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٤٩ | العلمانية والديمقراطية في تجربة كوردستان | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٥٠ | مختصر نشاطات وأحداث حياتي / ١٩٦١ - ٢٠١٧م | ط الأولى/٢٠١٨ | |
| ١٥١ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ١٥٢ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط لأولى / ٢٠١٩م | |

## ئەو كـتـێبانـەی لـەژێـر چاپــن

| ژ | |
|---|---|
| ١٥٣ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێـز: سورەتی (الرعد) تــاكو سورەتی (الزمر). |
| ١٥٤ | زنجیرەی: مسوڵمانینە! با باشتر تێبگەین و پێبگەین / دوازدە كتێب. |
| ١٥٥ | ڕەوشت و ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكان |

# کورتەیەک لە مێژووی ژیانی مامۆستا عەلی باپیر



• ناو: عـــەلی بـــاپیر وەتمان.

لـە دایکبـووی: ســـــــاڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشـــدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییـە ئیسـلامییەکانی لـە پەیمانگای ئیسـلامیی (ڕانیـە و سـلێمانیی) و لـە لای زانایانـی کوردسـتانی عێـراق و (دواتریـش کوردســتانی ئێـران) بەدەســتهێناون، لەسـاڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانـی بەپێزی لەبـەر کـردوە.

• لەساڵی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هـەر بۆیـە ئـەوکات عێراقـی جێهێشـتوە و ئـاوارەی ئێـران بـووە، کـە ئەوکاتـە لـە قۆناغـی دووەمـی زانکۆ بـووە، کۆلیجی شـەریعەت.

• لەسـاڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتـەوە کوردسـتانی عێـراق و لـە بەڕێوەبەرایەتـی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنـەوەی ئیمامەتـی داوەو، لـە مزگـەوتـی (نۆڕسـیی) لـە شـاری ڕانیـە دامـەزراوەو، بـەردەوام بـووە لەســەر دەرس گوتنــەوەو بانگــەوازی ئیســلامیی و...هتـد.

• یەکەمیـن بەرهەمـی لەسـاڵی: (١٩٨٣)زدا نووسـیوە بەنـاوی: (پوختەیـەك دەربـارەی ئیسـلام) پاشـان کتێب و بەرهەمەکانی بەردەوام بـوون کـە ئێسـتا ژمارەیـان لەسـەد (١٤٠) تێپەڕیـوە، بـە مەوسـووعەو کتێب و نامیلکـەو بەزمانـی کوردیـی و عەرەبیـی و، هەندێـك لـە کتێبەکانیشی بۆ زمانەکانی: فارسیی و، تورکیی و، ئینگلیزییش وەرگێـڕراون.

• لـە سـاڵی (١٩٨٧ز)دا پـاش سـاڵانێك لـە خەباتـی ئاشـکراو نهێنیـی پەیوەسـت لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانـی سـەدەی پێشـوودا ڕێکخسـتنە نهێنییەکانـی دامـەزران، چۆتـە چیـا و دەسـتی بەخەباتـی چەکداریـی کـردوە لـە چوارچێـوەی بزووتنـەوەی ئیسـلامییدا، کـە لەچەنـد ناوچەیەکـی کوردسـتاندا بنکـەو بـارەگای سـەربازیی هەبـوو دژی ڕژێمـی بەعـس و، هێـزی حەمـزەی لـە بنـاری چیـای قەندیـل دامەزرانـد.

• لـە سـاڵی (١٩٨٨ز)دا بـووە بـە ئەندامـی مەکتەبـی سیاسـیی بزووتنـەوەی ئیسـلامیی.

• لـە سـاڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵـی هەبـووە لـە ڕاپـەڕینی ئـازاری (١٩٩١ز) داو وریاکردنـەوەی خەڵکـی کوردسـتان، لـە مەبەسـت و ئامانجەکانـی ڕاپەڕینـی جەماوەریـی و ناسـاندنی بزووتنـەوەی ئیسـلامییدا.

• تاکـو سـاڵی (٢٠٠١ز) لەنێـو بزووتنـەوەدا درێـژەی بەخەباتـی خـۆی داوەو، لەهەمـان سـاڵدا لەگـەڵ زۆربـەی هـەرە زۆری هێـزو

مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسیی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٤٠) کتێب و نامیلکەی نووسیوە لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدە و فیقهـ و حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس و ئەخلاق و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان و...هتددا.

• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

• کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لە هەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.

• ئێستا پرۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردووە، تا ئێستا چەندان بەرگی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

# نێـوەڕۆک

www.alibapir.com

# پێشمەرگەی ئیسلام
یان
# مسوڵمانی موجاهید کێیە و چۆنە؟

هەرچەندە: ئەم بەرهەمە کاتی خۆی بەتایبەت بۆ: برا پێشمەرگە و موجاهیدەکانی ئەوساکە نووسراوە، بەڵام ئەوسا و ئێستاش: بۆ خوێنەرانی بەگشتی بەهرە و کەڵکی خۆی هەر هەیە و، زۆر مەسەلەی تێدا خراونە ڕوو، لە بوارەکانی: بووناسیی و، ئیمان و عەقیدە و، تێڕوانین و، پەرستشەکان و، ئاکار و ڕەوشتە کەسیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییەکان دا، کە مسوڵمانان بەگشتی پێویستە لێیان ئاگاداربن و پێیانەوە پابەند بن.